بسم الله الرحمن الرحیم

# پێناسی کتێب

ناوی کتێب: روانینێك له مێژووی ئیسلامی

نووسەر: نهاد جلال حبيب الله

بابەت: مێژوویی

دیزاینی بەرگ: حکیم ابوبکر

چاپخانە: رێ نوێ.

نۆبەو ساڵو شوێنی چاپ: یەکەم- ٢٠١٣- سلێمانی

تیراژ: ١٠٠٠

نرخ: ٢٠٠٠ دینار

لە بەڕیوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی(١٤١٢) ساڵی ٢٠١٣ی پێدراوە



Nihad.jalal@gmail.com

# پێشکەشە :

بە باوکی ئازیزم خوای گەورە بەهەشت بکاتە مەنزلی هەمیشەیی.

بە دایکی خۆشەویستم خوائیسان پارێزراوو تەمەن درێژ رایگرێت.

بە براو خوشکە ئازیزەکانم. هاوسەری خۆشەویستم وسایەی کچم.

بە هەموو مامۆستاکانم لە یەکەم رۆژی فێربوونەوە تائەمڕۆ.

بە هەموو خوێندکارانی بەشی مێژوو.

# پێشەکی

سوپاسو ستایشی بێپایان بۆ خوای گەورە، صەلاتو سەلامی خوا لە پێغەمبەرو ئالوبەیتو یارانی.

پاشان:

مێژووی ئیسلامی بەو پێیەی ماوەی چواردە سەدەیەك مێژوویەکی دیارو کارای لەئاست مێژووی مرۆڤایەتیدا هەبووە، بۆیە لە کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتیو ڕۆژئاواییشدا قسەیەکی زۆری لەسەر دەکرێت، ئەم گرنگیەی مێژووی ئیسلامیش خۆی لە بوونی هێزی کارای گۆڕاناکاری لە جیهانی مرۆڤایەتیدا دەبینێتەوە.

هەرچەندە هەریەك لەو کەسانەی باسی مێژووی ئیسلامی دەکەن بانگەشەی ئەوە دەکەن کە بە ڕێبازی حەقبینیو ڕاست بێژی بۆ مێژووی ئیسلامی دەڕوانن کەچی بە شێوەیەکی گشتی دەبینین ڕێبازی سۆزداری یان پەرچە کرداری یان دژایەتی بەسەر نوسینەکانیاندا زاڵە.

ئەوەی گرفتەکەی قووڵتر کردوەتەوە هەر یەکەیان دەڵێت: مێژووی ئیسلامی دەبێت وەك خۆی سەیر بکرێت بۆ ئەمەش لە منەوە وەری بگرە، وەك ئەوەی کەماڵی حەقیقەتی بۆ خۆی پچڕیبێتو بەدەر لە کارتێکەرە دەروونیو مرۆییەکان سەیری ئەو مێژووە بکات.

هەر ئەم منگەراییە وای کرد ڕێبازێکی نوێ بێتە کایەوە کە ئەویش زیاتر لەوەی ئامانج گیر بێت ڕێبازێکی پەرچە کردارییە، ئەم ڕێبازەش دەڵێت لە هەر لایەکەوە شتێ وەربگرە...هتد.

هەندێك پێیان وایە تەنها کەسێك دەتوانێت قسە لەسەر مێژووی ئیسلامی – وەك خۆی – بکات کە هاوڕێبازی ئەو مێژووە بێت، بەرامبەر بەمانەش تاقمێکی تر دەڵێن

دەی هەر کەس هاوڕێبازی مێژووەکە بێت لەسەر بنەمای سۆزداری بێ سنور هەنگاو بۆ ئەو مێژووە دەنێت، بۆیە دەبێت لەو بازنەیە بچێتە دەرەوە.

کۆمەڵێ لە موسوڵمانان بە بەڵگەی ئایەتی:(إن جائکم فاسق بنبأ فتبینوا)[1] یان ئایەتی: (قل یا ایها الکافرون......لکم دینکم‌و لی دین)[2] پێیان وایە تەنها مافی موسڵمانە بڕیاری ڕاست لەسەر مێژووی ئیسلامی بدات.

ئەم هەموو دیدو ڕوانینە تەنگژەیەکیان هێناوەتە کایە کە ڕێگەی ڕوانینیان بۆ مێژووی ئیسلامی سەخت‌و ئاڵۆز کردووە، تا ئاستێ ڕەشبینیەك ڕووی کردوەتە هەموان‌و کەسانێك چاو داخستن لەو مێژووە بەباشتر دەزانن.

بەڵام گەر بڕوانینە دەقەکانی قورئان‌و سوننەت، پاشان بڕوانینە ڕاستی فەلسەفەی مێژووو حەقیقەتی مرۆڤایەتی، دەبینین ئەم ڕایە ناپەسەندەو دەبێت خۆمانی لێ بەدوور بگرین.

شاعیر دەڵێت:

ولا تیأس فأن العجز عیب          من الإنسان في وقت الشباب

دەی کوا مرۆڤایەتی‌و ڕێڕەوی زانستخوازی لە پەککەوتندایە؟!!

وەك هەوڵێکی سەرەتایی‌و پاش خوێندنەوەیەك بۆ مێژووی ئیسلامی‌و ڕوانینە جۆربەجۆرەکان بۆ ئەو مێژووە، هەوڵدەدەین ڕێڕەوێکی گشتی‌و تا بکرێت نزیك لە ڕاستی بۆ ڕوانینمان بۆ مێژووی ئیسلامی بخەینە ڕوو، بەڵکو سەرەتایەك بێت بۆ هەوڵی باشترو بەرفراوانتر لەو مەیدانەدا.

بۆ ئەم کارەش بابەتەکە بەسەر چەند بەشێکدا دابەش دەکەین کە بریتین لە:

---

[1] - الحجرات: ٦.

[2] - الکافرون: ١-٦.

١. ئامانج له روانین بۆ مێژووی ئیسلامی.

٢. سەرچاوەکانی وەرگرتنی مێژووی ئیسلامی.

٣. بنەماکانی روانین بۆ مێژووی ئیسلامی.

٤. مێژوونووسانی کۆن و نوێ.

٥. سەردەمەکانی مێژووی ئیسلامی.

٦. نموونەیەك له ڕووداوێکی ناو مێژووی ئیسلامی.

بەو هیوایەی توانرابێت کونجێکی کەمی ئەو مەیدانەی مێژووی ئیسلامی پڕبکاتەوەو کەمێك لەو تەنگژەیە کەمبکاتەوە یان هیچ نەبێت ڕوون بکاتەوە.

نهاد جلال حبیب الله
سلێمانی

# بەشی یەکەم

## ئامانج لە ڕوانین بۆ مێژووی ئیسلامی

سەبارەت بە ئامانج لە ڕوانین بۆ مێژوووی ئیسلامی ئەوەی باسی دەکەین لە دیدی پابەند بوون بە ئیسلامەوە دەیڵێین، لەو نێوەندەشدا خاڵە گشتیەکانی ئەو ڕوانینە بۆ ناموسوڵمانەکانیش لە خۆ دەگرێت، ئەوەشی پەیوەست بە ئیسلام نەبێت دەتوانێت کۆمەڵێك لەو خاڵانە بگرێتە خۆ.

## پێشەنگی کردن بە قورئان و سونەتەوە:

دڵنیاین تەنها سەرچاوەی ئیسلام قورئانو سوننەتی پێغەمبەرن(صلی الله علیه وسلم)، ئەو دوو سەرچاوەش گرنگیەکی زۆریان داوە بە ڕوانین بۆ مێژووی مرۆڤایەتی بە گشتیو مێژووی یەکتاپەرستان بە تایبەتی، دەبینیت لە قورئانی پیرۆزدا بەسەرهاتی پێغەمبەرانو پیاوچاکانو کۆمەڵگەو سەربازان و...هتد باسکراوەو لە خودی ئەو خستنەڕووەشدا ڕاستکردنەوەو لێکدانەوەی بۆ کراوە، هەروەك باسی فیرعەونو قارونو بێ باوەڕانو سەرکەشانو لادەران لە ئایینی یەکخواپەرستی کراوە، کاتێ بەسەرهاتی پێغەمبەر یوسفو لوقمانو زولقەرنەین لە قورئانی پیرۆزدا دەخوێنینەوە، دەزانیت ئەمە شێوە گەیاندنێکی پەیامی خوداییە بۆ مرۆڤەکان، بەڵام جیاوازی ئەمەیان لەوەدایە ئەم شێوازە لە مەیدانی گێڕانەوەی پێڕەوێکدا خۆی دەنوێنێت کە خوای گەورە پێوانی دەکاتو ڕاستو هەڵەکانی یەکلا دەکاتەوە تا بەو ڕێککردنەوەی پێڕەوە نمونەیەکی جوانو تەواو بۆ گوێگر یانْ خوێنەر بخرێتەڕوو کە پێڕەوی بکات.

بۆ نمونە لە ژیانی پێغەمبەر ئەیووبدا نموونەی جوانیو خۆ ڕاگری فێر دەبین، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو چاکەو جوانیەدا ڕێککردنەوەی قورئانی پێمان دەڵێت لەوپەڕی

سەختیدا بڕیاری زیاد لە پێویست نەدەن وەك ئەوەی پێغەمبەر ئەییووب بەرامبەر قسەیەکی خێزانەکەی بڕیاریدا هاوکات بە چاکبوونەوەی لە خێزانەکەی بدات، یان لە نمونەی ژیانی پێغەمبەر یوونسدا شیکاری بۆ مەرجەکانی ژیانی بانگخواز دەکات، یەکێك لەو مەرجانە بەشێوەی ڕاستکردنەوەی قورئانی دەخرێتە ڕوو کە ئەویش بریتیە لەوەی لە بانگەواز بۆ خوادا دەبێت بڕیارو هەنگاو لەدەست خوادا بێت چونکە پێغەمبەر یوونس بەبێ مۆڵەتی خوایی ناوچەی کاری خۆی جێ هێشت، بەڵام خوای گەورە ئەمەی بۆ ڕاست کردەوە.

ئەمە لە فەرمودەکانی پێغەمبەری خواشدا بەدی دەکرێت، جا بۆ بەدواداچوونی ئەمە با خوێنەر بڕوانێتـە کتێبەکانی فەرموودەی وەك (صحیح البخاری، صحیح مسلم، مسند الامام احمد، سنن الترمذي، سنن النسائی، سنن ابن ماجە...).

دەی ئەو کەسەی پەیوەستی قورئانو سوننەتە ئەگەر هیچ بەهایەکی روانینی مێژوویشی نەبێت، دەبێت لێرەوە پێشەنگی بە قورئانو سوننەتەوە بکاتو بکەوێتە لێکدانەوەی مێژوویيو پەند لێوەرگرتنی، بەڵام بیری بێـت خاتر گرتنو چاوپۆشی کردن پێناوی دڵسۆزی نیە، بەڵکو پێناوێکی سوزداریە، هەروەك ساختەو پێچدان بە ڕاستیەکان پێچەوانەی کرۆکی حەقیقەتە.

با پەرچەکرداری ساختەکاران ئێمەش تووشی سوزداری شێوێنەر نەکات، بەڵکو وەك ئەو ڕێرەوەی قورئانو سوننەت بۆی دیاری کردوین هەنگاو بنێین.

## زانینی ئەزموونی موسڵمانان لە پەیڕەوی ژیاندا :

یەکێك لە مەرجو پێکهاتەکانی ژیارو گەشە پێدانی، بریتیە لە گەشەدان بە ئەزموونی پێشینان، گەورەترین هەڵەیەکیش کە تاکی پێشکەوتووخواز تووشی دەبێت ئەوەیە کە بیەوێت لە خاڵی سفرەوە لێ بنەوێتو تەنها پشت بە خۆی ببەستێتو چاو لە ڕابردوو داپۆشێت وەك ئەوەی ئەو سەرەتایەو پێش ئەو لە هزرو کاریدا بوونی نەبێت، بەڵکو دەبێت ئەزموونی پێشینان وەربگیرێت تا لە هەنگاونانمان بەرەو پێشەوە خێراتر بچین، هەروەك ڕێبازی گەیاندنی خوایش بەهەمان شێوە بووە تا گەشتە پلەی کەماڵ، ئێمەش ئەو ڕێبازەمان پێویستە.

ئەگەر بڕوانینە پەیامی خودایی بۆ مرۆڤەکان، دەبینین لە یەکەم هەنگاوەوە بە کەماڵی نەهاتووەو هەر هەنگاوێکی دواتریش پەیوەستی ڕابردووی پەیامەکە بووە، بۆ نموونە کاتێك پێغەمبەر عیسا لە دوای پێغەمبەر مووسا دێت ئەرکی خۆی ڕوون دەکاتەوە: (أحل لکم بعض الذي حرم علیکم)[1] واتە پێوانێکی خودایی پێیە تا بەو پێوانە بەراوردو جیاوازی نیوان واقعو ڕابردوو نیشان بداتو دواتر بڕیاری هەنگاونانی پێشڕەوی بدات، بە هاتنی پیغەمبەری ئیسلامیش ئەزموونی پێشینان ڕەت نەکرایەوە، بەڵکو پێوانی شەریعەتی ئاسمانی بۆ بەکارهات وەك لە چەندین شوێندا دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئەزموونی ڕابردووی پێغەمبەرێك یان پیاو چاکێك دەکات.

دەی موسڵمان پێویستی بەوە دەبێت ئەزموونی پێشینەی هەڵگرانی پەیامەکەی بزانێت تا بزانێـت لە چیدا تێدەکەونو لە چیدا سەر دەکەون، چونکە پێغەمبەر(ﷺ)

---

[1] - آل عمران: ٥٠.

دەفەرموێت: (لا يلدغ المؤمن من جحر واحد مرتين)،[1] کەواتە پێویستە ئوممەتی ئیسلام دووجار نەگەزرێت.

کەسی بانگخواز بۆ پێشڕەوی کاری بانگەوازی دەبێت ژیانی هەڵگرانی یەکەمی پەیامی بانگەوازو ئامانجو ڕێڕەوو ئەنجامیان بزانێت تا بەهۆیەوە هەنگاو بەرەو کەماڵ بنێت، کەسی موجاهیدیش دەبێت ئەزموونی موجاهیدانی ناو هاوەڵانو دواتر کەسانی وەك عیمادەدینی زەنگیو سەلاحەدینی ئەییوبیو موحەممەدی فاتیح بزانێت، کەسی زانستخواز پێویستە شارەزای ئەزموونی کەسانی وەك پێشەوایان بوخاریو موسلیمو ئەحمەدو ئیبن تەیمیەو ئیبن حەزمو ئیبنولقەیم و....هتد بێت.

ئەم شارەزاییەش بۆ ئەوە نیە بمانەوێت بیکەین بەسەرچاوەی پێڕەوی کارمان چونکە تەنها قورئانو سوننەت سەرچاوەی پێڕەوی کارمانن، بەڵکو تا ببێتە شانۆیەك بۆ نیشاندانی ڕاستو هەڵەو ئاستی هەوڵی هاونیازان، ئیتر لەوێوە تاکی موسڵمان لە پێڕەوی ژیانیدا هەنگاوی پێشڕەوی خۆی دەنێت.

ئامانجێکی تری زانینی ئەو ئەزموونە ئەوەیە تا بیسەلمێنین مێژووی ئیسلامی لە پێشکەشکردنی ئەزموونی ژیانیدا نەکەوتووەو خاڵی باشی بەدەست هێناوە، هەم بۆ هاندانەوەی تاکی موسڵمانو هەم بۆ دەمکوت کردنی ئەوانەی دەیانەوێت بە پەردەی ساختەکاریو چەواشەکاری ٣٠٪ بەسەر ٧٠٪دا زاڵ بکەن.

---

[1] - صحيح البخاري،الرقم ٥٧٨٧، صحيح مسلم، الرقم ٥٤٢٧، سنن أبوداود، الرقم ٤٢٤١، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٨٧٢٥، سنن الدارمي، الرقم ٢٧٣١، صحيح ابن حبان، الرقم ٦٦٤.

## وەرگرتنی پەندو ئامۆژگاری:

ئەمە ئامانجێکی بنەڕەتی روانینە بۆ مێژوو بە گشتی، بەتایبەت موسڵمانان کە هەڵگری پەیامی خوداییو شەریعەتیان لەبەردەستدایە تا بە جێی بگەیەنن، دەبێت بزانن پێشینان چۆنن تا پەندو ئامۆژگارییان لێ وەربگرن، پەند لە ڕێرەوی ڕاستو هەنگاوی چەوتی موسوڵمانان لە مێژووی ئیسلامیدا وەربگرن، ئامۆژگاری سەر زارو کرداری مەشخەڵانی ئوممەتی ئیسلامی لە مێژوودا وەر بگرن.

خوای گەورە بۆ خستنەڕووی پەندو ئامۆژگاری بۆ موسڵمانان لە قورئانی پیرۆزدا نمونەی ژیانو کاری پێشینانی هێناوەتەوە، بەڵام دەبێت ئەو هەڵەیەی ئەمڕۆ موسڵمانان تێیکەوتون ڕاستی بکەنەوە، ئەویش ئەوەیە تەنها نموونە جوانەکان بە پەندو کەسە باڵاکان بە جێ ئامۆژگاری وەر دەگرن، لە ڕاستیدا ئەمە بە تەواوی واتا پەرچەکردارێکە بەرامبەر ستەمی ستەمکاران، پەرچەکردارێکی پڕ لە هەڵەشە، چونکە نە قورئانو نە سوننەتو نە مێژوونوسانی موسڵمان ئەم پێناسەیان نەبووە، بەڵکو کرۆکی پەندو ئامۆژگاری ئەوەیە کەسێك فێر بکەیت چۆن بەڕێگەی ڕاستدا بڕواتو لە ڕێگە لا نەدات، ئیتر ئایا نمونەو سەرەنجامی کەسێکی بۆ دێنیتەوە کە بەو ڕێگە ڕاستەدا ڕۆیشتووە تا ببێت بە سەرمەشقێك بۆی وەك خوا دەفەرموێت: (قد كان لكم فى رسول الله أسوة حسنة)[1] یان نموونەو سەرئەنجامی کەسێکی بۆ دێنێت کە لە ڕێچکەکە لایداوەو چی بەسەرهاتووە تا ئەو کەسە خۆی لێ بەدوور بگرێت وەك نمونەی فیرعەونو برادەرەکانی بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی، یان ئەم نموونەی سێیەمە کە مێژووی ئیسلامی زیاتر خۆی لەمەدا دەبینێتەوە، ئەویش ئەوەیە کەسانێك ڕێی ڕاست دەگرنەبەر، بەڵام لەو نێوەندەدا کارتێکەرەکان ڕێیان لێ تێك دەدەن، دەبێت موسڵمان

---

[1] - الأحزاب: ٢١.

لێرەدا پەندو ئامۆژگاری هەنگاوە چاکو هەڵەکانیشی وەربگرێت، ئەوەی بە پێوانی حەقیقەت بوو با بیکاتە مەشخەڵ، ئەوەش بە ڕێرەوی هەڵەدا چوو با ئەم ڕاستی بکاتەوە.

پەندو ئامۆژگاری تەنها بۆ کەسی تاك نیە، بەڵکو ئەوە دەوڵەتو سەرکردەو کەسانو جەماوەرو هەموویانن کە دەبێت پەندو ئامۆژگاری وەربگرن، نەوەك لە بازنەی هەوڵە تاکەکەسیەکاندا بەرتەسك بکرێتەوە، ئەمەش هەڵەیەکەو نیشانەکانی لە دەرکەوتندان، ڕوانینی گشتی ئوممەت لەبیر بکرێتو هەوڵە شەخسیەکان گرنگییان پێ بدرێت، ئیتر ئایا هۆکاری لاوازی گورو تینە یان وەهنو ترسی مەرگ بێت یان ئەوە بە باشتر بزانرێت.

## وەستان لە ڕووی ساختەکاری وسۆزداریدا :

یەکێکی تر لە ئەنجامەکانی ڕوانین بۆ مێژووی ئیسلامی دەرباز بوونە لەو تەنگژەیەی کە هەر دوو لایەنی ساختەکاریو سۆز داری ڕۆڵی تیدا دەبینن، ئەم دوو پەیامە دوو دەستەی دوژمن بەیەکتر هەڵیانگرتون، دەستەی دوژمنانی ئیسلامو موسوڵمانان پەیامی ساختەکاریو تەزویر لە مێژووی ئیسلامیان هەڵگرتووە، دەستەی موسڵمانانێکی کەمتواناو هەڵەشەش پەیامی سۆزدارییان پێیەو وەك پەرچەکردارێك بۆ ساختەکاران ئەمانیش دەکەونە هەڵەوە.

بەکورتی ساختەکاران ئامانجیان شێواندنی مێژووی ئیسلامیەو بۆ ئەمەش ئەم هەنگاوانە دەنێن:

١. هەمیشە هەوڵدەدەن مێژووی ئیسلامی لە لایەنە ڕۆحیەکەی دابڕ بکەنو بە مێژوویەکی خوێنڕێژی ڕەها لەسەر نیازی دەستەلاتداری نیشانی بدەن، ئەمانە ئەو دەستەن کە هەر بڕوایان بە پەیامی ئیسلام نیە لە نموونەی ڕۆژهەلاتناسانی وەك :(کارل برۆکمانو توینبی) و...هتد، یان دەستە گومراو لادەرەکانی ناو موسڵمانان کە ئەو مێژووە بە هەڵە دەزانن دەیانەوێت هیچ نرخێکی ئایینی بۆ نەهێڵنەوە.

٢. لە پاڵ دەیان ڕووداوی ڕاستیدا چەند ناراستەیەك تۆمار دەکەن.

٣. گومان لەسەر سەرچاوەکانی مێژووی ئیسلامی دروست دەکەن، ئەڵبەتە ئەوەی لەگەڵ مزریان ناگونجێت.

٤. پەردەپۆشی لایەنی ژیاریو زانستی و...هتدی ئەو مێژووە بکەنو تەنها مێژووی خوێنو شمشێر نیشان بدەن، ئەویش لە جیاتی نیشاندانی شمشێری حەقو جیهاددا شمشێری ستەمو داگیرکاری بە پێناس دەزانن.

لە وەڵامدانەوەی ئەمەدا هەوڵی پەرچەکرداریو سۆزداری لای هەندێك موسڵمان دروست دەبێت کە هەموو مێژووی ئیسلامی بە دیدێکی تر تەماشا دەکەنو هەوڵەکانیان لەم خاڵانەدا چڕ دەبنەوە:

أ. بە پیرۆز سەیرکردنی مێژووی ئیسلامی.

ب. چاوپۆشی لە هەڵەو کەموکورتیەکانی ئەو مێژووە بەهەر بیانویەك بێت.

ج. لە هەمووی سەختتر مێژووی ئیسلامی بە یەکپارچە دەبەنە قاڵبی بیروباوەڕو فتوای ئایینداریو بێباوەڕی لە سەر دەدەن.

چارەسەر :

دەبێت بۆ ڕیگری لە ساختەکاران هەوڵ بدەین هەم پارێزگاری بە ڕاستیەکانی مێژووی ئیسلامیەوە بکەین کە لە ژێر بنەمای زانستیدا ڕاستکراونەتەوەو هەموو ساختەکانیان ئاشکرا بکەین، بەڵام لەم کارەدا هەڵەشەییو سۆزداری هەڵەیە، بۆ ڕاستکردنەوەی کاری سۆزدارانیش دەبێت ئەوەیان تێ بگەیەنین کە:

١. مێژووی ئیسلامی مێژوویەکی پیرۆز نیەو پیرۆزی بۆ ئایینەکەیە نەك مێژووی هەوادارانو هەڵگرانی، بەڵام مێژووی ئیسلامی مێژوویەکی پڕ شکۆداریو پێشڕەویە، لەگەڵ ئەوەشدا هەڵەو کەموکورتی زۆر هەڵدەگرێت، چونکە پەیڕەوکارەکانی مرۆڤن.

٢. قورئانی پیرۆز نەپێکانی پێغەمبەرانو هەڵەی باوەڕدارانی تۆمار کردووە، دەی ئیتر چۆن نابێت هەڵەی نا مێژووی شوێنکەوتوانی پێغەمبەران نیشان بدرێن!؟ ئامانجێکی روانین بۆ مێژووی ئیسلامی ڕاستکردنەوەی ئەم باری تەنگژەی نێوان ساختەکاریو سۆزداریە.

# تەواوکردنی ڕێرەوی مێژوونوسان:

ئەگەر ئەمڕۆ ئێمە قسە لەسەر مێژووی ئیسلامی دەکەین، دەبێت بیرمان نەچێت ئەم کارەمان لەسەر بنەمای هەوڵی دڵسۆزانو زانایانێکی پێش خۆمان بووە کە نرخو بەهای مێژوویان زانیوەو ڕێی ڕاستی ئەو مێژووەیان تۆمار کردووە، بەتایبەت مێژووی ئیسلامی لە هەر مێژوویەکی تر وردترو دروستتر تۆمار کراوە، ناوی کەسەکانو گێڕەوەکانو ئاکارو ژیانو ئاستی متمانەو ڕاستکۆیی‌و زانستیان تۆمار کراوە.

ئەگەر پێشەوایان(تەبەری‌و ئیبن خەیاتو ئیبن کەثیر و...هتد) تۆماری ڕوداوەکانیان بۆ کردوین، ئەوا کەسانی وەك ئبن خەلدونیش قسەیان لەسەر کردووەو نووسینەوەیەکی تریان بۆ ئەو مێژووە کردووە، دەی ئەم کاروانی لێکۆڵینەوەیە هێشتا ماویەتی تا بگاتە کۆتا، ئەم ئەرکەش لەسەر شانی نەوەی نوێی ئوممەتی ئیسلامی بە تایبەتو هەر تاکێکی مرۆڤایەتی بە گشتیە، چونکە مێژوونوسانی ڕابردوو ئەرکی خۆیانیان بە جوانترین شێوە بەجێگەیاندووە، ئەوەی لەسەر شانی ئێمەیە ڕێککردنو سەرووبنکردنو پوختکردنەوەی بەرهەمەکانی ئەوانە لە لایەك، لەلایەکی تریشەوە بە ئەمانەتو لەژێر بنەمای زانستیدا بکەوینە تۆماری مێژووی هاوچەرخ، ئەگەرنا لە دنیادا دادگای مرۆڤایەتی‌و لە دواڕۆژیشدا دادگای خوای گەورە ئەو تاوانەمان لێ قبوڵ ناکەن، بەراستی زۆرجار ئەمەش پێویستی بە پاڵنەرێکی بەهێزی وا هەیە کە وات لێ بکات بەهایەکی باڵاتر لە گیان بەدیبکەیت تا ئامادە بیت بەرەو سەرووتر هەنگاو بنێت.

## شایەتیدان :

شایەتیدان لەسەر کەسێك کە شیاوی شایەتیدان بێت واجبەو خۆ لێ بەدوورگرتنی لادانە لە فەرمانی خوای گەورە، وەك خوا دەفەرموێت: (ولا تكتموا الشهادة ومن يكتمها فأنه آثم قلبه)،[1] دەی مێژووی ئیسلامی لە هەر بوارێکدا پێویستی بە شایەتیدانە، بەلاّم شایەیتدانێك لەسەر بنەمای شەریعەت وەستا بێت: (ان تضل احداهما فتذكر احداهما الاخرى)[2] واتە لەسەر بنەمای سۆزداری نەوەستابێتو شایەتی حەق بدات:(ولا يجرمنكم شنئان قوم على الا تعدلوا)،[3] بەو پێیە نابێت نە سۆزداری بۆ برایانی موسڵمانو نە ئارەزووی هەڵخەڵەتان بە دوژمنانی مێژووی ئیسلامی وامان لێ بکات ساختەو ناراستی لە شایەتیداندا بە کار بهێنین.

پێویستە کەسانێك هەبن بە بەڵگەی دروستەوە لە سەرچاوەکانەوەو لە ژێر بنەمای زانستیدا شایەتی بۆ لایەنی ژیارو و سیاسیو زانستخوازیو سەربازی... ئەم ئوممەتە بدەن، کەمبوونەوەی شایەتانی ناو ئوممەتی ئیسلامی لەسەدەکانی دواییی مێژووی ئیسلامیدا ڕێی بۆ ناحەزانی ئیسلامو موسڵمانان خۆشکرد تا ببنە شایەتو بە پێی پێکهاتەی دەروونیو روانینیان بۆ ئەو مێژووە شایەتی بدەن، ئیتر لە بەرەی بەرامبەریشیاندا شایەتانێك نەبن کە بە بەڵگەوە بارەکە ڕاست بکەنەوە.

کەواتە لەم روانگەوە دەوانین بڵێین:

١.شایەتی دان واجبە.

٢. دەبێت بە حەق بێت.

---

[1] - البقرة: ٢٨٣.

[2] - لبقرة: ٢٨٢.

[3] - المائدة: ٨.

٣. شایەتی نەدان بە زیانی ئوممەتی ئیسلامی دەشکێتەوە.

## تێگەشتن لە ڕەوتی ئەمڕۆ:

وتەیەکی جوانی زانایان هەیە کە دەڵێن: (من لا يعي التاريخ لا يعي المستقبل) دەی ئەگەر کەسێك نەتوانێ لە داهاتووی تێ بگات کە خۆی لەناو ئەو شریتەدا نیە ئەی چۆن لە ئەمڕۆی تێدەگات کە خۆی تیایدا دەژیو ناتوانێت لەسەرەوە بۆی بڕوانێت، بێگومان بۆ تێگەشتن لە ئەمڕۆ دەبێت لە دەورو سەرچاوەو ڕێرەوی پێشتری ئەمڕۆ ئاگادار بیت، هەموو ئەو باسکردنە پێشبینانەش کە خوای گەورە لە قورئانو پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرموودەدا باسیان کردون، بە مەبەستی پەند لێ وەرگرتن بوون بۆ ڕەوشی موسوڵمانان لە هەر قۆناغێکدا بن.

ئەمڕۆ باری موسڵمانان لە پشێویو بارگرژیەکی سەختدایەو مەردی مەیدانی دەوێت بە ڕاستی هەنگاو بنێت، بۆ ئەمەش دەبێت لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵگەی ئیسلامی وەربگریتو بزانیت لەمڕۆدا ئەو بارانە چۆنن، ئەوجا بزانیت قورئانو سوننەت چۆن ڕێنمایی بە موسوڵمانان دەدەن بۆ ئەو ڕێگانە ، دواتر بڕوانینە مێژووی پێشترو بزانین چۆن ئەو لایەنانەیان بە جێ گەیاندون، لە چیدا سەرکەوتوو بوونو ئەنجامەکەی چی بوو، واتە لە سێ خاڵی ئەو سەردەمە بکۆڵینەوە:(ئامانج لە هەنگاونانەکە، پەیڕەوی هەنگاونانەکە، ئەنجامی هەنگاو نانەکە)، لێرەوە لە ڕەوشی باری ئەمڕۆ تێ دەگەین.

بۆ نمونە ئەمڕۆی باری کۆمەڵگەی ئیسلامی لەم خاڵانەدا خۆی دەبینێتەوە:

- دوورکەوتنەوەی موسڵمانان لە سەرچاوە سەرەکیەکانی ئیسلام(قورئانو سوننەت).
- دوبەرەکیو پەرتبوونی موسڵمانان.
- ژێر دەستەییو بێ دەسەڵاتی.

- شالاوی خاچپەرستیو سەهیونیو ڕۆژئاوایی.
- دواکەوتەیی زانستیو لاوازی ڕۆحیەتی ئاینی.
- بڵاوبونەوەی دەستەو تاقمە گومڕاو لادەرەکان.

دەی لە قۆناغەکانی مێژووی ئیسلامیدا ئەم گرفتانە هاتونەتە ڕێو چارەسەریش کراون، جا چۆنێتی چارەسەرەکەو تێگەشتن لەبارەکە ئەوەی دەوێت لەبازنەی سنورداری ئەمڕۆ بچیتە دەرەوەو بە چاوێکی فراوانتر بروانیت، چونکە بەراستی گەر کەسێك شارەزای شالاوەکانی پێشووی خاچپەرستان نەبێت لە جەنگی ئەمڕۆی ڕۆژهەلاتو ڕۆژ ئاوا تێ ناگات، کەسێك شالاوی هزری ڕۆژئاواو ناحەزانی ئیسلامو بڵاوبوونەوەی دەستە گومڕاکان لە قۆناغەکانی مێژووداو شوێنو پێگەیانو شێوازی بەرنگاربوونەوەیان نەزانێت لەڕۆدا بارەکەی لا قورس دەبێتو هەندێ جار ئەو کەسە وای لێ دێت وادەزانێت ئیتر گەیشتوەتە بنبەستو چارەسەر نەماوە.

ئەمە ڕێرەوی ژیانەوکەس بەتەنها بەبێ ڕابردوو ناتوانێت بگاتە کەمالێ (انما بعثت لأتمم صالح الاخلاق)،[1] چەندین بەڵگەی تریش کە دەیسەلمێنن بۆ تێگەشتن لە ئەمڕۆ پێویستە لە ڕابردوو تێ بگەیت چونکە هەردووکیان پەیوەستی یەکترن.

---

[1] - مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٨٧٤٩، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤١٦٢، شعب الإيمان للبيهقي، الرقم ٧٧٢٤، صححه الألباني في الجامع الصغير وزيادته، الرقم ٤١١٤.

## بەشی دووەم

## سەرچاوەکانی توێژینەوە لە مێژووی ئیسلامی

ئەوەی پێشتر قسەمان لەسەرکرد، تەنها دروستکردنی هەستو بەرپرسیارێتیەکی بوو لەپێناو ئەوەی هەنگاو بنێین بەرەو مێژووی ئیسلامیو دواتریش نیشاندانی ئامانجی ئەوکارە بوو، بەومەبەستەی دەرونی کەسانێك ئامادەیی هەبێت بۆ خوێندنەوەو ڕامان لە مێژووی ئیسلامی، هەنگاوی دوای ئەوەش بریتیە لە ناسینی سەرچاوەکانی لێکۆڵینەوە لە مێژووی ئیسلام تا خوێنەر بزانێت بۆ وەرگرتنی بابەتێکی ناو مێژووی ئیسلامی چ سەرچاوەیەکی پێویستەو ئەو سەرچاوە چۆنەو چۆن لێی بنەوێتو چۆنیش لێی وەربگرێت، چونکە کەرەستەکانی کارەکە ئەو سەرچاوانەن، بۆیە ئەگەر کەسێك شارەزای کەرەستەکانو شێوەی بەکارهێنانیان نەبێت، بێگومان کارەکەی لەنگی تێدا دەبێت.

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین سەرچاوەکانی مێژووی ئیسلام بۆ چەند بەشێك دابەش بکەین، ئەمەش بەپێوەری گشتی مێژوویی کاری لەسەر دەکەین:

یەکەم: قورئانی پیرۆز:

یەکەم سەرچاوەی وەرگرتنی مێژووی ئسلامی بریتیە لە قورئانی پیرۆز، چونکە خودی قورئان یەکەم سەرچاوەی ئایینەکەیە، چ جای مێژووی ئەو ئایینە یان مێژووی بنیادنەری سەرەتای پەیامەکە (موحەممەد صلی الله علیە وسلم)و هاوەڵانی کە بەردی بناغەی ئەو مێژووەیان دانا.

ئەمەش تەنها لای موسڵمانان بە یەکەم سەرچاوەی مێژووی ئیسلامی دانانرێت، بەڵکو نەیارانی قورئانو ئیسلامو مێژووی ئیسلامیش لەسەرئەوە یەکدەنگن، وەك چۆن

ئەوان تەورات و ئینجیل بە یەکەم سەرچاوەی لێکۆڵینەوە لە مێژووی جوولەکە یان مەسیحیەت دادەنێن، یان نووسینەکانی ئەرستۆو ئەفلاتون بە بنەڕتی لێکۆڵینەوە لەو کەسانە دەزانن، یان لەوحە بەجێماوەکانی سەردەمی حامورابیو یاسا دانراوەکانی دەکەنە سەرچاوەی یەکەم بۆ تێرامان لەو سەردەمەو کەسایەتیەی، بەهەمان شێوە قورئانیش بەیەکەم سەرچاوەی مێژووی ئیسلامی دادەنێن، گەرچی کۆمەڵێك تێبینیو ڕەخنەیان لێ هەیە کە سوپاس بەخودا ڕۆژ بە ڕۆژ ڕاستیە مێژووییەکان دەبنە بەڵگەی ڕاستی زانیاریەکانی قورئان.

لێدوانی گشتی قورئانی پیرۆز بۆ مێژوی ئیسلامی خۆی لەم خاڵانەدا دەبینێتەوە:

١- خستنەبەرچاوی ڕەوشی پێش هاتنی ئیسلام و مێژووی ئیسلامی:

قورئان سەرەتا پوختەیەکی مێژووی مرۆڤایەتی هەر لە بوونیەوە تا سەردەمی مێژووی ئیسلامی دێنێت، باس لە دروستبونو بەهای مرۆڤو ئەرکو ئامانجو ئەنجامی دروستبونیو شێوەو هۆکاری هاتنەسەردنیایو ئەرکی ناو دنیاو ڕەوشی سەرزەوی دەکات، بۆ ئەوەی دواتر بەرچاوڕوونیەك بێت بۆ ناو مێژووی ئیسلامی، واتە قورئانی پیرۆز ئەوەمان پێدەڵێت کە مێژووی ئیسلامیش قۆناغێکی ناو ئەو مێژووەیەو بۆ زانینی ڕێگەیەکیش نابێت لە نیوەی ڕێوە هەنگاو بنێیتو ئەگەر سەرەتاکەی نەزانیت دەکەویتە هەڵەوە یان هیچ نەبیت لەسەرجاوەی پێشهاتە هاوشێوەکانی بێئاگا دەبیت.

بۆ خستنەڕووو تۆمارکردنی ئەمەش هەوڵدەدات ڕای خۆی بچەسپێنێو بوونی هەرگومانێك بەرپەرچ دەداتەوە(ذلك الکتاب لا ریب فیه)،[1] ڕاستی گێڕانەوەو

---

[1] - البقرة: ٢.

لێکدانەوەکەش دەگەڕێتەوە بۆ خواو بەدووری دەگرێت لەدەست تێوەردانی مرۆیی(إنا نحن نزلنا الذکر و إنا له لحافظون).[1]

دواجاریش لە دوو لایەنەوە ڕەخنە لە بەرهەمو نوسراوەکانی ئەوکات دەگرێت:

١-مرۆڤەکان لەپێکانی ڕاستیدا نەگەشتوونەتە کەماڵو بڕێك لە ڕاستییان تێدایە، دیاریکردنی ئەو بڕەش پەیوەستە بە لەخواترسی ئەو کەسە یان ویژدانداری ئەو تاکە، واتە زۆربەی جار پشکی زیاتری ڕاستی بۆ کەسی لەخواترسە لەگەڵ بوونی هەڵەیدا، بەڵام کەسانێکیش هەن کە لەخوا ترس نین لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستیەك دەڵێن، ئەمانە کەمنو لەنێو خوانەناساندا دیارن، هەروەها هەموو ڕاستیەکیش ناڵێن.

٢-مرۆڤەکان لەبەر سەپاندنی ڕاکانی خۆیان تەنانەت ڕاستیەکان دەشێوێنن، ئەوان ڕاستیەکانی ناو تەوراتو ئینجیلیان شێواند، بەمە هیچ پێودانگێکی ڕاستییان نەهێشتۆتەوەو ئامادەنین ڕێ بەڕاستی بدەن تا بەجیاو سەربەستی بۆ خۆی بمێنێتەوە، بۆیە قورئان بوو بە تەواوکەری ڕاستیەکانی پەیامە خواییەکانی پێشوو پلەی کەماڵی وەرگرتو کۆتا پەیامی خوداییش دەبێت، لەبەرئەوە ئەمجار پاراستنەکە نادرێتە دەست مرۆڤ و خودا خۆی دەیپارێزێت(إنا نحن نزلنا الذکر و إنا لهالحافظون)،[2] لێرەوە ڕاستیە مێژوییەکان تەنها لەقورئانەوە پلەی ڕاستی تەواویان هەیە.

پاشان هەوڵدەدات مێژوی یەکخوداپەرستان پەیوەستی یەکتر بکات، بۆیە کە باس لە سەردەمی مێژوی ئیسلامی دەکات، دەیانبەستێتەوە بە باوەڕدارانی پێش ئیسلامەوە وەك دەفەرموێت (أنا لما طغي الماء حملنکم في الجارية)،[3] واتە موسڵمانانی ئەم

---

[1] - الحجر: ٩.

[2] - الحجر: ٩.

[3] - الحاقة: ١١.

سەردەمە دادەنێت بە بەشێك لە موسڵمانانی رابردوو، یان جوولەکەکانی ئەوکات بە مێژووی پێشتریانەوە دەبەستێتەوە.

دواتر گرنگترین لایەنەکانی سەرەتای مێژووی ئیسلامی دەخاتەڕوو، وەك ئەوەی باسی قۆناغی مەککەو ژیانی ناو مەدینەو جەنگی بەدرو ئوحود دەکات، لەگەڵ ئەمەشدا هەوڵدەدات بە پێوەرە خوداییەکە لێکدانەوە بۆ ئەوانە بکات، تەنانەت چاوپۆشی لەخودی کەسایەتی موحەممەدیش(ﷺ) ناکاتو ڕوداوەکان وەك خۆی دێنێت، وەك سەبارەت بە ئیجتیهادێکی نەپێکراوی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:(عبس وتولي، أن جاءه الأعمی...)، چەندین نموونەی تریش لە قورئانی پیرۆزدا بەدیدەکەین.

بۆ یە ئەگەر بمانەوێت هەر قۆناغیکی مێژووی ئیسلامی وەربگرین، دەتوانین بەوپەڕی وردەکاریەوە بەپێوانی قورئان بۆ لێکدانەوەی مێژوویی لێی بکۆڵینەوەو ئەنجامێکی چاك بەدەستبخەین.

بەڵام نەیارانی ئیسلام یان ئەوانەش کە باوەڕیان پێی نیە، لەگەڵ ئەوەی قورئان بە یەکەم سەرچاوەی مێژووی ئیسلامی دادەنێن، کۆمەڵێك ڕەخنەیان لێی هەیەو بە سەرچاوەیەکی تەواوی نازانن، گرنگترین گازندەو ڕەخنەکانیشیان خۆی لەم خاڵانەدا دەبینێتەوە:

١-ئەوان دەڵێن ئەم قورئانە وتەی خودایی نیە، بەڵکو لێکدانەوەی کەسایەتی موحەممەدە (ﷺ) بۆ مێژوو، واتە موحەممەد (ﷺ) چۆن لە مێژوو تێگەشتووە یان چۆن ویستویەتی هزری خۆی بسەپێنیت، بەو شێوەیە لە قورئاندا تۆماری کردووە، بەم پێیە قورئان لە بەها خوداییەکەی دابڕدەکەنو مۆرکێکی مرۆیی پێدەدەن، ئەمەش واتە لە سیفەتی کەماڵ بەدەرە، کەواتە- بەو پێیە- قورئان پێکهاتەیەکی دوولایەنەی ڕاستیو ناراستی دەبێت، بۆیە خوای گەورە لە قورئاندا هۆشیاری بەرامبەر بەم روانینە

دەداتو دەفەرموێت (أفتؤمنون ببعض الكتاب وتكفرون ببعض، فما جزاء من يفعل ذلك منكم إلا خزى في الحياة الدنيا ويوم القيامة يردون إلى أشد العذاب).[1]

٢-ئەوان پێیان وایە قورئانیش وەك پەیامە ئاسمانیەکانی تر یان وەك نوسراوەکانی تری پێشووی مێژوو، بەگشتی وەك ئەوانەی هیرۆدۆتو چەندێکی ترو بەتایبەتی نووسینەکانی ڕۆژهەلاَت هەولَیداوە مێژوویەکی ئەفسانەیی تۆماربکات، باسی فریشتەکان لەجەنگی بەدرو هێنانی ڕەشەبا لە خەندەقو چەندین نمونەی تر کە موسولَمان بە موعجیزە ناویان دەبات، لای ئەوان هەروەك داستانی دابەزینی خواوەندەکانە لە جەنگەکانی سەردەمی دێرینی یۆنانو ڕۆمان، بەمجۆرە لەو بڕوایەدان قورئان لەقۆناغی نووسینەوەی ئەفسانەیی مێژوو دەرنەچووە.

٣-ڕەخنەیەکی تریان لە تۆماری مێژوویی یان تێڕامانی مێژویی قورئانی ئەوەیە کە دەلَێن قورئان یەکلایەنە قسەدەکاتو هەردەم هەواداری یەکخواپەرستانەو وەسفیان دەکاتو سەرکۆنەی بیباوەڕان دەکاتو لەدژیان دەوەستێتو ناوە بەد واتاکانیان بەسەردا دەدات، بەمجۆرە لە هەلَوێستی بێلایەنبوون لە تۆماری مێژوویی دایدەڕنن.

٤-هەروەها دەلَێن قورئان لە تۆمار یان لێکدانەوەی ڕووداوە مێژووییەکاندا کورتبڕی دەکاتو خۆی لە وردەکاری یان ڕوداوەکانی نێوان دووماوە دوردەخاتەوە، بەوجۆرە تۆمار یان لێکدانەوەیەکی کرچ وکالَو ناتەواو دەدات بەدەستەوە.

٥-یان گلەیی ئەوە دەکەن کە تۆمارە مێژووییەکانی قورئان خەسلَەتێکی پیرۆزیان پێدراوەو جێگەی قسە تێداکردنو مشتومڕیان نەهێشتوەتەوە، بۆیە هەرکات بتەوێت قسە لەسەر تۆمار یان لێکدانەوەی مێژوویی قورئانی بکەیت، بەرەوڕووی تەکفیر یان

---

[1] - البقرة: ٨٥.

کوشتوبڕ یان وەدەرنان دەبێتەوە، لەبەرئەوە وەلاتانی یەکجارەکی ئەو تۆمارەو پشت پێنەبەستنی باشترە.

٦-ڕەخنە لەوە دەگرن کە قورئان لە تۆماری مێژوویدا دووبارەکردنەوەی زۆر دەگرێتەبەر، بۆ نموونە لە دەیان شوێندا ڕووداوی ناو مێژووی پێغەمبەر مووسا(علیه السلام) دێنێتەوە کە لە هەمان کاتدا یەك شتە، یان هەندێك جار جیاوازیەك (تناقض) لە گێڕانەوەی یەك ڕووداودا هەیە، جگە لەوەش خەسڵەتی چیرۆك تیایدا زاڵە تا لێکدانەوەی وردی مێژوویی.

## (وەڵام بۆ ڕەخنەکانیان)

١- ئەگەر قورئان وتەی موحەممەد (ﷺ)نیە، خۆ موحەممەد (ﷺ)نەخوێندەواربوو، پاشان ناوچەیەکی سنووداری دیبوو، جگە لەوەش لە شارەزایی ڕابردوودا زانیاریەکی کەمو سنورداری هەبوو و ناوچەکەشی سەرچاوەی مێژوویی زۆر دەگمەنی هەبوو، ئیتر چۆن قسە لەسەر هەموو ڕابردووی مرۆڤایەتی بکات، جگە لەوەی زانیاری گەلێکی زۆری تێدایە کە ئەمڕۆ ڕاستی زانستی نیشانی دەدات، چەندین بەڵگەی تریش هەن کە بەرامبەر بەو ڕایە دەوەستن و لێرەدا نایانهێنین.

٢- ئەگەر بڕوانینە قورئانی پیرۆز، دەبینین هزرو بیروباوەڕ لە چوارچێوەی ڕووداوە مێژووییەکاندا لەبیر ناکات، قورئانیش پەیامێکە بۆ ژیانی موسڵمانان و ناکرێت لە بەهاکانی ئیسلام بەدووربێت، پاشان لە فەرموودەشدا دەیان یان سەدان هاوەڵ ئامادەبوون چەندین نموونەی ئیعجازی دەگێڕنەوە، دەی ئەمانەش مرۆڤ بوون، واتە بەتەنها لە قورئاندا وا نەهاتووە، لەمەدا دەبێت ئەو کەسانە گلەیی لە خۆیان بکەن کە دیدێکی تەواوی ماددیگەری و دنیاییان هەیەو بڕوایان بە چەمکی پەیامی ئاسمانی نیە،

بۆیە گلەییەکەیان دەچێتە مەیدانی ململانێی حزبییەوە نەك حەقیقەتێکی هەستپێکراو، ئەمەش تەنها کاری ئەمڕۆیان نیەو رابردووشیان وێنەی لەو جۆرەی زۆرە.

٣-سەرەتا ئەو رەخنە لە خودی ئەو کەسانە دەگیرێت کە هێندە یەکلایەنانە دەڕواننە باس‌وخواسەکان کە هەوڵ نادەن لەو رەخنەی خۆیان لە قورئان وردببنەوە یان لە تەنگاوی دەمارگیریو بڕیاری یەکلایەنەدا گیرۆدەن، بەتایبەت لەبەرامبەر مێژووی ئیسلامیدا.

پاشان لەقورئاندا پێناوی شایەتیدان هەیە (شهد الله أنه لا إله إلا هو والملائكة وأولوا العلم قائماً بالقسط)[1] لەشایەتیدانیشدا سۆزو ڕق ڕۆڵ نابینێت، خودایش لە هەموان دادپەروەرترەو بەدوورە لە ڕاستی نەوتن، هەر بۆیە ڕەخنە لە خۆشەویستترین بەندەی خۆی دەگریت (موحەممەد(ﷺ)) یان هەر لەسەرەتاوە ڕەخنە لە پێغەمبەر ئادەمو پێغەمبەر نووحو ئیبراهیمو ئەیووبو یووسفو یوونسو مووسا (علیهم السلام)و (موحەممەد(ﷺ)) دەگرێتو لە قاڵبی بێدار کردنەوەیاندا ڕاستیەکانیان بۆ دەخاتەڕوو.

٤- مەبەستی قورئان لە گێڕانەوە مێژووییەکاندا گێڕانەوەی هەموو مێژوو نیە، بەڵکو پێدانی پێوانێکی گشتیو چەند نموونەیەکی بەکارهێنانیەتی بۆ ئەوەی بۆ تێڕامانی مێژوویی بەکاربێت.

٥- قورئان ئازادی بیروڕای بە هەموو مرۆڤەکان داوە، کێ بڕوای پێدێنێت یان نایەنێت سەربەستە(فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر)[2] پیرۆزی قورئانیش بۆ موسوڵمانانە، ئینجا مێژووی ئیسلامیش نموونەی ڕاجیاوازی زۆری هەبووە، ئەگەر

---

[1] - آل عمران: ١٨.

[2] - الکهف: ٢٩.

توندیەکیش هەبووبێت سەرچاوەکەی قورئان نەبووە، دەبێت بڵێین قسەکردن لەرووی قورئاندا تاك بەرەو ڕووی بێباوەڕی دەکاتەوە.

٦- هەروەها مەسەلەی دووبارەکاری ناو قورئان جگە لەئامانجی هەناسەدان‌و چەسپان‌و بیرخستنەوە چەند ئامانجێکی تری هەیە، سەبارت بە بوونی جیاوازی ڕاو دەقەکانی ناو قورئان(تناقضات) ئەوە لە ئەنجامی کرچ‌و کاڵی تێگەیشتن‌و زانیاری ئەو تاکەوەیە، ئەگەرنا بۆ نمونە بڕواننە بەرگی کۆتایی کتێبی (اضواءالبیان)ی ئیمامی(شنقیطي)لەو بارەوە وردەکاری بەخشیوە.

## دووەم: فەرموودەکانی موحەممەد(ﷺ):

سەرچاوەی دووەمی مێژووی ئیسلامی بریتیە لە فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە موسڵمانەکان جیا لەلایەنە مێژووییەکە، لایەنی ئایینی خۆشیانی لێوەردەگرن، چونکە ئەوان لەو ئایەتە قورئانیەوە بۆ وتەو فەرمایشتی پێغەمبەر (ﷺ) دەڕوانن کە دەفەرموێت (وما ينطق عن الهوى، إن هو إلا وحي يوحى، علّمه شديد القوى)،[1] بۆ کردەوەکانیشی لەڕوانگەی ئەو ئایەتەوە سەیری دەکەن کە دەفەرموێت (قد كان لكم في رسول الله أسوة حسنة)،[2] فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)خۆیان لە سێ شێوەی سەرەکیدا دەبیننەوە:

١- گوفتاری پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەمەش یان دەقاودەق وتەکەیەتی یان هاوشێوەی وتەکانیەتی، زیاترینی فەرموودەکانی ئەمانەن‌و لەگرنگی‌و زۆریدا بەپلەی یەکەم دێن.

٢- کرداری پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەمەش جموجوڵی پێغەمبەری خوایە((ﷺ)) کە هاوەڵانی دەوری یان خێزانەکانی گێڕاویانەتەوەو بە فەرموودە دادەنرێت، چونکە کردار بەکارێك رازیبوون بە گوفتاری بێگومان دەکات.

٣- هەڵوێستی پێغەمبەر(ﷺ): هەڵسوکەوتی پێغەمبەری خواو هەڵوێستیەتی بەرامبەر بە گوفتار یان کردارێکی هاوەڵان یان کەسانیتر، ئەمەش بەشێکە لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا، دەکرێت لەڕووی متمانەی فەرموودەشەوە جۆرەکانی فەرموودە بە سێ جۆر دابنێین کە بریتین لە:

٤- صەحیح: ئەمانە گومانیان تێدا نیەو ڕاستەوخۆ وەردەگیرێن.

٥- حەسەن: ئەمانەش بەپلەی دووەم دێن وەردەگیرێن‌و کاریان پێدەکرێت.

---

[1] - النجم: ٣-٥.

[2] - الأحزاب: ٢١.

٦- ضعیف: ئەمانە گومانیان لەسەرەو وەرناگیرێن‌و بەکارنەهێنانیان باشترە.

لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) هەمان شێوە بەدیدەکەین، چونکە فەرموودە ڕاڤەی قورئان دەکات بۆ مرۆڤەکان، بۆیە لە لایەنە مێژووییەکەیەوە سێ لایەن دەگرێتەخۆ:

١- هێنانی مێژوویەکی پێشتر.

٢- لێدوان لەسەر ڕووداوی ئەوکات.

٣- پێشبینی بۆ داهاتووی موسڵمانان کە بەشێکی زۆری بەدیهاتووەو بووە بە مێژوو و بەشێکی دیکەشی لە ئێستاو داهاتوودا دەبێت.

هەمان ئەو شتەی سەبارەت بە سەرچاوەی یەکەم هاتووە، سەرچاوەی دووەمیش دەگرێتەوە، هێندە هەیە کە بۆ سەرچاوەی دووەم نەیارانی ئیسلام ومێژووی ئیسلامی زیاتر ئیشیان تێداکردووەو هەوڵیانداوە بەهەر جۆرێك بێت لەنرخی کەم بکەنەوە.

خاڵێکی دیکەی دیار سەبارەت بە سەرچاوەی دووەم ئەوەیە کە لەمەدا سەرچاوەکانی فەرموودە لەنێوان سوننەو شیعەدا دابەشدەبن، بەڵام ئەوەی دیارە زۆربەی جیهان کاتێك قسە لەسەر فەرموودەکانی موحەممەد (ﷺ) دەکەن، زیاتر پشت بە سەرچاوەکانی ئەهلی سوننە دەبەستن‌و سەرچاوەکانی شیعەیان وەلاناوە، چونکە سەرچاوەکانی شیعە لەدەست خۆیاندا تەسکبوونەتەوە، خاڵێکی دی ئەوەیە کە ئەو قسەکردنەی لە سەر فەرموودە دەکرێت بەهیچ جۆرێك لەسەر قورئان ناکرێت.

فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بوونەتە کەرەسەیەکی بنەڕەتی‌و پێوانێکی بەهێز بەدەست مێژوونوسان بەگشتی‌و موسڵمانەکانیان بەتایبەتی تا پێوانی مێژووی پئیسلامی پێبکەن، وەك دیاریکردنی ماوەی خیلافەت‌و جەنگی جەمەل وصفین‌و فەتحی قوستەنتینیەو...هتد.

## سێیەم: سەرچاوە مێژووییەکانی موسڵمانان:

دەشێت یەکسەر ئەو پرسیارە بێتە ڕێمانو بپرسێت بۆچی دوای قورئانو سوننەت موسڵمانان قسە لەسەر مێژوی ئیسلامی دەکەن؟ بۆچی خەڵکانی تر قسەیان لەسەر نەکەن، لە وەڵامدا دەڵێین خۆزگە جیهانی ڕۆژئاوا هێندە هۆشیاری هەبوایە کە بیتوانیایە لە سەرەتاوە ئاگاداری جیهانی ئیسلامی بێتو قسەی لەسەر بکات، بەڵام جەنگی ناوخۆو ستەمی کڵێساو دواکەوتەیی زانیاریو هۆشیاری تاکی ڕۆژئاوایی ئەو ڕۆژگارە وایکرد نەیانتوانی بیر لە مێژووی ئیسلامی بکەنەوەو بێئاگابن لە جیهانی ئیسلامی تا ئەوەی دوای هاتنی کۆمەڵێك مێژوونووسی موسڵمانو توندبوونەوەی باریان لەگەڵ جیهانی ئیسلامیدا هێشتا نەیانتوانیبوو بیر لە مێژووی ئیسلامی بکەنەوە وقسەی لەسەر بکەن.

مێژوونوسانی موسڵمان بۆ سێ بەشی سەرەکی دابەشدەبن:

یەکەم: ئەهلی سوننەو جەماعە: ئەمانە ئەوانەن کە سەر بە مەزهەبی سوننەت بوون، دەسەڵاتی جیهانی ئیسلامیش سوننە مەزهەب بوو، هەر ئەمان بوون وەك یەکەم کەس ڕەوتی تۆماری مێژوویی ناو جیهانی ئیسلامییان خستەڕێ، نمونەی ئەمانەش لە ئیبن هیشامو ئیبن خیاط تا طەبەریو بەغدادیو ئیبن کەثیرو ئیبن خەلەکانو ئیبنولئەسیرو زەهەبیو ئیبن خەلدونو شەوکانی و...هتد بوو.

ئەمانە لەگەڵ ئەوەی هەوادارییەکیان بۆ دەسەڵاتی ئیسلامی هەبووە، بەڵام هیچکات چاوپۆشییان لە هەڵەو کەموکورتیەکانی دەسەڵات نەدەکردو دواتریش ئەو ددپەروەریو تۆمارە وردەیان بوو بە سەرچاوە بۆ نەیارانی ئیسلامو موسڵمانان تا بۆ مەبەستی دژایەتییان چیان دەوێت لێیان وەربگرن ولایەنەکانی دی کەمبایەخ ڕاگرن.

دووەم: دارودەستەی شیعە: شیعەکان نەیارانی دەسەڵاتی ناو جیهانی ئیسلامی بوون، بۆیە هەوڵیاندەدا دژ بەو دەسەڵاتە بنووسن وبڵێن، هەرچەندە دەوڵەتگەلێکی خۆشیان هەبووە وەك فاتمیو بوەیهیەکانو قەرمەتی و...هتد، بەڵام لەباسکردنی هەوڵەکانی ئەوانیشدا ڕۆڵیان هەبووە، سەرچاوەکانی ئەهلی شیعە بوون بە کۆگایەك بۆ ڕۆژهەڵاتناسان تا تۆماری چەوتیەکانی جیهانی ئیسلامی بە موسڵمانان بفرۆشنەوە، نمونەی ئەوانەش بریتین لە مەسعودیو ئەبولفەرەجی ئەسفەهانی نوسەری کتێبی (الاغانی)و چەندینی تر.

سێیەم: دەستەو تاقمەکانی تر:

وەك خەواریجو موعتەزیلەو ئەشعەری و...هتد، ئەمانە ڕکەبەرییان لەگەڵ دەسەڵات ساتەو ناسات بوو، زیاتر خەواریجەکان بەرهەڵستی سەربازییان هەبووە، ئەم دەستەو تاقمانە بە گشتی لە تۆماری مێژووییدا ڕاستگۆ بوون، ئەگەر چی هەندێك جار دەمارگیرییان بۆ ڕەوتو مەزهەبی خۆیان وای لێکردون قسەی ناهەقو ناڕاست بکەن.

گرنگ ئەوەیە موسڵمانان لە تۆماری مێژووی ئیسلامیدا یەکەم هەنگاویان ناوەو سێ هەنگاویشیان بڕیوە:

١-تۆماری ڕووداوەکان بەپێی هەر گێڕانەوەیەکی ڕاستو ناڕاست.

٢- پێداچوونەوەی کەسایەتیەکانو هەڵسانگاندنیان لە دادگای زانستی ریجال (جەرحو تەعدیل)دا.

٣- لێکۆلینەوە بۆ ڕووداوەکان.

ئەوەی ماوە بریتیە لە بەراوردی نێوان سەردەمەکانو لێکدانەوەی هزری وجیاکردنەوەی بابەتەکان، لەمەشدا چەند هەنگاوێك نراون بەڵام پێویستی بەهەوڵی زیاترە.

## چوارەم: سەرچاوە مەسیحیەکان:

جەنگی مەسیحیەت لە مێژووی مرۆڤایەتیدا جەنگێکی دیارەو پاش دەربازبوون لە سەردەمی زەلیلیو وەرگرتنی دەسەڵات بەهەر پێناوێك بێت هاتنی سەردەمی دەسەڵاتیان بوو، بەدوای ئەوەشدا جەنگی سەختی لەگەڵ جوولەکەدا دەستپێکردو کەوتە چەوساندنەوەی جوولەکەکان تا ئەوەی جەنگی گەورە هات کە بریتیبوو لە جەنگ لەگەڵ موسڵمانان‌دا، ئەمەش هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەستپێکرد، بۆیە هەر لەوکاتەوە جەنگێکی توند بەرامبەر بە یەکتر بناغەی داناو بەرەبەرە جەنگی زانستیش دەستپێکرد، بەڵام دەستپێکردنی توندی لەدوای ئەو قسەیەی لویسی شانزەیەم بوو لە شاڵاوی نۆیەمی خاچپەرستیدا کە داوایکرد (با جەنگی هزریو بیروباوەڕی دەستپێبکەین).

مەسیحیەت تا ئەمڕۆش دانی نەناوە بەبوونی ئیسلام وەك پەیامێکی ئاسمانی، بۆیە تا ئێستاش پێی وایە موسڵمان بە هەموو مێژوو و ڕابردوویانەوە لە هەڵەدا بوونو ڕۆڵی خراپەو گێرەشێوێنیان نیشانداوەو بە مردنیشیان دۆزەخ دەبێتە بەشیان، بەمجۆرە لە دادگای ئایینیو دادگای مرۆییشدا شکستو پشکی خراپ بۆ موسڵمانان دەبێت.

زۆربەی ڕۆژهەڵاتناسەکان مەسیحی بوونو سەر بە خوێندنگە مەسیحیەکان بوون، هەروەها هەموو هەنگاوە ڕۆژهەڵاتناسیەکانیش لەلایەن کڵێسای پاپاوە پاڵپشتی دەکران، ئەگەریش بڕوانینە هەوڵەکان زۆربەیان تێکەڵ بە خەسڵەتی تەبشیری(موژدەبەری)دەکران.

بۆیە ئەوانە هەمیشە هەوڵیاندەدا ئەوە بڵێن (ئیسلام زادەی جولەکەیە دژ بە مەسیحیەت، مێژووی مەسیحیەت زۆر زاڵە بەسەر مێژووی ئیسلامیدا، مێژووی ئیسلامی مەترسیە بۆ سەر مرۆڤایەتی).

بەڵام ئەم گوتارە بەسەر هەموویاندا زاڵنابێت، چونکە هەیانە موسڵمان بووەو وەسفی ئیسلامو مێژووی ئیسلامی کردووە، هەیانە تا ئاستێکی زۆر خۆی لە خەسڵەتەکانی دژەئیسلام بوون داماڵیوە، هەشیانە تەنها ئەرکی وەرگرتنو گواستنەوەی بەجێگەیاندووە، بە کورتی سەرچاوە مەسیحیەکان بە شێوەیەکی گشتی دیدی رەخنەو دژایەتییان بۆ مێژووی ئیسلامی هەیە.

## پێنجەم: سەرچاوەکانی جوولەکەکان:

ئەبێت پێش هەموو شتێك دیدی جوولەکە بۆ مێژوو بە گشتیو مێژووی خۆیان بەتایبەتی لەبەرچاوبگرین تا بزانین سەرچاوەکانیان چ خەسڵەتێکیان لە خۆگرتووەو هۆکاری ئەو خەسڵەتانەش بۆچی دەگەڕێتەوە.

جوولەکە لێکدانەوەیەکی ماددی بۆ جیهان هەیەو خۆشی تیایدا بە سەرمەشق دەزانێت، بەڵام دواتر دەڵێت مێژووی ئێمە سێ خەسڵەتی لەخۆ گرتووە:

١. هەمیشە ستەممان لێکراوە. (کات)

٢. لە هەموو شوێنێکی ئەم جیهانەدا ستەممان لێکراوە. (شوێن)

٣. ئەو ستەمەی ئێمە هیچ وێنەیەکی نەبووەو نیەو نابێت. (تایبەتمەندیو جیاوازی)

بۆیە لێرەوە خۆیان بە خاوەن ماف دەزانن‌و هەڵدەدەن مافی زەوتکراوی خۆیان وەربگرنەوە، لە پێناو ئەمەشدا پێویستیان بە تۆمەتبارکردنی بەرامبەرەکان هەیە، لەمەشدا دەستناگرنەوەو بۆ هەر دەرفەتێك دەگەڕێن، لە پێناو ئەمەشدا ئەم هەنگاوانە دەگرنەبەر:

- نوسینی ڕاستەوخۆ دژ بە بەرامبەر.
- ساختەکاری لەنووسینەکانی بەرامبەردا وەك نمونەیان لەگەڵ ئیمامی ئیبن تەیمیەدا کە چووبوون بەڵگەنامەیەکی ساختەیان دروستکردبوو دەیانگێڕایەوە بۆ سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام شەیخولئیسلام فێڵەکەی ئەوانی ئاشکراکرد بەهۆی

توێژینەوەیەکی وردی بۆ بەڵگەنامەکەو بەراوردکرنی بە رووداوە مێژووییەکانی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ).[1]

- هێنانی چاکەگەلو پیاهەڵدانی مێژووی بەرامبەر لەپێناو دانانی چەند ناڕاستیەکی بەئامانجی خۆیان.

بۆیە لەم ڕوانگەوە هەوڵدەدەن بەهەر شێوەیەك بێت بەرامبەر بە مێژووی ئیسلامی بوەستن.

---

[1] - إسلام بن عيسى الحسامي: سيرة شيخ الإسلام ابن تيمية وحكاياته مع أبناء زمانه، ط١، دار ابن كثير، (عمان-أردن:٢٠٠٦م)، ص١٠١-١٠٢.

## شەشەم: سەرچاوەکانی دی:

ئەمەش زیاتر لە دوو لایەنی مادیگەرایی سۆڤیێتیو عەلمانیەتی توندی ڕۆژئاوادا خۆی دەبینێتەوە، سۆڤیەت لەبەرئەوەی یەکپارچە دژی مرۆڤایەتی بوو جگە لەخۆی، بۆیە ئامادەی وەرگرتنی ڕایەکی تر نەبوو، ئەوان نەوەك تەنها دژی مێژووی ئیسلامیو لەئاست عوسمانیو مەملوکیو عەبباسیو ئومەویەوە ناوەستن، بەڵکو قسەی توند لەسەر خودی پێغەمبەر(ﷺ) دەکەن، هەڵوێستی ڕەشی خۆشیان بەرامبەر بە موسڵمانان نیشانداو کوشتو بڕێکی توندیان لێکردن، ئەو گلەییە توندە لەوان بۆیە دەکرێت چونکە بانگەشەی ڕزگارییان لە سەدەی نوێدا خستەڕوو، بەڵام ئازادیەکە موسڵمانانو نەیارانی تریان لێی بێبەش بن، هەمان خەسڵەت لای عەلمانیەتی پەردەپۆش بە مەسیحیەت دەرکەوت کە سەرمەشقیان ئەمەریکا بوو، تا ئەمڕۆش ئەمەریکا بە توندی لە ڕووی ئیسلامو موسڵماناندا وەستاوەو سەرقاڵی داگیرکردنی هەنگاوبەهەنگاوی خاکیانە، ڕەنگدانەوەی توندی دیدی سلبی ئەوان بۆ ئیسلامو پەرچەکرداری سەختی موسڵمانان وایکرد وڵاتێکی وەك دانیمارك ببێتە سەرچاوەیەك بۆ گاڵتەکردن بە پێغەمبەر(ﷺ)و هەموو وڵاتانی تری ئەورووپاش بوونە پاڵپشتی، کەواتە دیدی ئەوان لە کردەی ئەمڕۆیاندا دیارە.

٧-نوسینەکانی ئەمڕۆ لەسەر مێژووی ئیسلامی:

لە ڕاستیدا ئەمڕۆ بۆتە کۆگای تەنگژەی مێژووی ئیسلامیو هەموو پشێویو شلۆقی دیدی ڕابردوو لەگەڵ ململانێی سەختی نوێ لەمەدا ڕەنگیداوەتەوەو مەردی مەیدانی دەوێت تا بتوانێت لێی دەربازبێت، هەڵوێستی دروستی ئەمڕۆش پاش بەرپرسیارێتی لای خواو پاداشتی خودایی، مەردایەتی مێژوویی دەبێت.

لەمڕۆدا هاوکات بە شاڵاوی فرەلایەنەی نەیارانو هاوپەیمانبوونیان پێکەوە، دەستیانداوەتە هەڵمەتێکی توندی ڕەخنەیی بۆ سەر مێژووی ئیسلامی تا ئاستێك گومان لەسەر هەموو لایەنو ئیجابیەتێکی مێژووی ئیسلامی دروست دەکەن، لە کوردستانیشدا سەرەتاکانی ئەو کارە دەرکەوتووە، کارەکەش هەڵمەتێکی کەمزانستیە، بۆیە لەمڕۆدا ڕۆڵی توندو لە داهاتوودا کاریگەری کەم دەبێت.

بەرامبەر بەمەش موسڵمانان ئامادەییان نەماوە کە هەڵەی مێژووی ئیسلامی لەبەرچاو بگرن، بۆیە پاڵپشتیەکی کەمیان هەیەو گومانی توند لە نووسینەکانیان دەکرێت، هەرچەندە برێ هەوڵی باشیش لەو بارەیەوە دراوە، بەڵام بەراستی توێژینەوەی مێژوویی لەمڕۆی جیهانی ئیسلامیدا راستیەکی دڵتەزێنە.

# بەشی سێیەم

## بنەماکانی روانین بۆ مێژووی ئیسلامی

پاش ئەوەی چەند باسێکی پێشوومان شیکارکرد لەسەر مێژووی ئیسلامی، باش وایە ئێستاش باسی کۆمەڵێك بنەمای سەرەکی بکەین کە موسڵمان دەبێت لەو روانگەیەوە بڕوانێتە ئەو مێژووە، چونکە لە ڕاستیدا هەندێك هەڵەی خوێندنەوەو تێگەیشتن‌و بڕیاردانی موسڵمانان بەدیدەکرێ لە روانینیان بۆ مێژووی ئیسلامیی کە دەبێت راست بکرێنەوە، هەرچەندە ئەم بنەمایانەی باس دەکرێن مەبەست لەوە نییە کە ئەمانە هەموویان راستکردنەوەی هەڵەی موسڵمانانن، بەڵکو کۆمەڵێکی زۆری ئەو بنەمایانە لای زۆرینەی موسڵمانان روونن.

گرنگترین بنەماکانی روانینمان بۆ مێژووی ئیسلامیی بریتین لە:

١ـ مێژووی ئیسلامیی مێژوویەکی مرۆڤایەتییە:

ئەو روانینەی وادەبینێت کە مێژووی ئایینەکان یان هەر مێژوویەك کە مرۆڤ تێیدا بەشدارە بەدەرە لە مێژووی مرۆڤایەتی، ئەوە دوچاری هەڵە تێگەیشتن بووە تا سۆزو بنەمای خۆی بخاتە مەیدانێکی واقیعییەوە.

مێژووی ئیسلامی مێژوویەکە کە مرۆڤەکان تێیدا بەشدارن‌و لەسەر رۆڵی بەرچاوی مرۆڤەکان رێکردەی خۆی دەبڕێت، بەڵکو خودی ئایینەکە بۆ ڕێنیشاندانی مرۆڤەکان هاتووە ﴿أَوَمَنْ كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَنْ مَثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِنْهَا كَذَلِكَ زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾.[1]

---

[1] - الأنعام: ١٢٢.

مرۆڤەکانیش رۆڵی خۆیان دەنوێنن لەبەردەم ئەو ئایینەدا کە ئایا دەیکەنە چرای رووناکی رێگەیان یاخود دەبنە دوژمنی‌و دەیانەوێت بیکوژێننەوەو حەزیان لە تاریکییە ﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ﴾.[1]

لە مێژووی مرۆڤایەتیدا دەبێت ئامادەبین کەموکورتیی مرۆڤەکان لەبەرچاوبگرین، بەڵام دەبێت بزانین کەموکورتیی مرۆڤەکان بەڵگە نییە بۆ کەموکورتی ئەو رەوشەیان لەو پێناوەدا کە مرۆڤەکان بەکاریدەهێنن، بۆ نموونە کەمتەرخەمی‌و کەموکورتی موسڵمانان نابێتە بەڵگەی کەموکورتی ئاینی ئیسلام یان بکرێتە پێوەر بۆ ئەوەی کە بەکارهێنانی ئاین مایەی کەموکورتی مرۆڤەکانە، بەڵکو ئاین کەموکورتی مرۆڤەکان کەمدەکاتەوە، چونکە بە دڵنیاییەوە ئیسلام توانی کەموکورتی‌و کەمتەرخەمی کۆمەڵێك لە مرۆڤەکان کەم بکاتەوەو شارستانێتیەکیان بۆ دروستبکات کە تا ئەمڕۆش درێژە دەکێشێت.

بابڕوانینە دیدی ئیسلام بۆ مێژووی موسڵمانان، کە هەر لە پێش ئیسلام‌و سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە تا ئەمڕۆ باری موسڵمانان لە قاڵبی مرۆڤبوونیاندا باسدەکات‌و لەو پلەوپایە بەرزتریان ناکاتەوە، خوای گەورە لە بارەی پێغەمبەری ئازیز ئادەم (ﷺ)و حەوای دایکمان‌و نەوەکانیانەوە دەفەرموێت:﴿قُلْنَا اهْبِطُوا مِنْهَا جَمِيعًا فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٣٨) وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾.[2]

دواتر لەبارەی پێغەمبەرەکانی دیکەوە باسی ئەو کارانەیان دەکات کە خوای گەورە بۆیان راستدەکاتەوە هەر لە کارەکەی پێغەمبەر یوونس (ﷺ)و پێغەمبەر نووح (ﷺ)و

---

[1] - الصف: ٨.

[2] - البقرة: ٣٨-٣٩.

پێغەمبەر مووسا (U)و پێغەمبەر داود (U)و پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ) کە هەموویان لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون، بەڵام ئەوانە نیازی خراپیان نەبووە، بەڵکو لەو کارەیاندا نیازی خێریان هەبووەو ئیجتیهادیان کردووەو سەرەنجامێکی وای بووە، خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿..وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْمًا﴾.[1]

پێغەمبەر(ﷺ) وانەیەکی فێری موسڵمانان کرد تا بزانن کێنو ژیانیان چۆنە، بۆیە فەرمووی(کل بنو آدم خطاءء خیر الخطائین التوابون)،[2] واتە(هەموو ئادەمیزادێ هەڵەکارە، چاکترینی هەڵەکاریش ئەوانەن کە تەوبە دەکەنو دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا).

بۆیە ئەگەر خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی ژیانی پێغەمبەران (علیهم السلام) بکات لە قاڵبێکی مرۆڤایەتییاندا، موسڵمان چۆن دەکرێ ژیانی موسڵمانان لەو قاڵبە بباتەدەرێ، ئەگەریش خوای گەورە ئەو تێکەوتنەی پێغەمبەران (علیهم السلام) باس بکات، موسڵمان چۆن دەتوانێت راستی موسڵمان نەخاتەڕوو، بەڵام وەك چۆن قورئانی پیرۆز راستیو چارەسەرەکەی دەخاتەڕوو، دەبێت ئێمەش ئەو هەنگاوە قورئانییە بنێین.

٢ـ مێژووی ئیسلامیی گێڕانەوەیەکی دروستە:

زۆربەی کات کە دەچینەوە بۆ سەرچاوەکانی مێژوو لە لای مێژوونووسان بەگشتی، دەبینین زۆرێکیان وەك رۆمانێك یان باسکردنی رووداوێك مێژوو تۆماردەکەن بەبێئەوەی بنەمای زانستی بەکاربهێنن بۆی، واتە سەرچاوەکە خۆی لێڵە، ئیدی دەبێت

---

[1] - طه: ١١٥.

٢ - سنن الترمذي، الرقم٢٤٨٣، سنن ابن ماجة٤٢٤٨، الرقم، المستدرك على الصحيحن، الرقم٧٦٨٥، مسند أحمد بن حنبل، الرقم١٢٧٩٥، مسند أبي يعلى الموصلي، الرقم٢٨٤٢، سنن الدارمي، الرقم ٢٦٨٠،حسنه الألباني في الجامع الصغير وزيادته، الرقم ٨٦٤٤.

نووسینەکانی دواتر چی بن، بەڵام لە مێژووی ئیسلامیدا ئەم خاڵە کەمتر بەدی دەکرێ، بەڵکو زۆر بە دەگمەن بەدیدەکرێ، چونکە لای زانایانی ئیسلام زانستی ریجال (جەرح و تەعدیل) هەیە کە هەڵسەنگاندن دەکات بۆ کەسەکان، هاوکات سەنەد لە گێڕانەوەی مێژوویدا بەکاردێت، سەنەد واتە گێڕانەوەی رووداوێك دەمبەدەم و لەچەند کەسێکەوە، جا زانایانی ئیسلام بە زانستی (جەرح و تەعدیل) هەڵسەنگاندن و شیکاری دەکەن بۆ کەسەکانی سەنەدەکەو لەو سۆنگەوە راستی و ناراستیی گێڕانەوەکان دەخەنەڕوو، بەڵام ئەمە لەلای گەلان و ئایین و مێژوونووسانی دیکە بەکارنایەت مەگەر کەمێك نەبێت، زانستی فەرموودە کە لەناو موسڵماناندا زۆر بڵاوەو دەکەوێتە پێش راستکردنەوەی گێڕانەوەکانی فەرموودەکان، ئەم زانستە بەشێوەیەکی نیمچە سادەتر بەکاردێت بۆ گێڕانەوەی مێژوویی، بەمە دەتوانین بە شێوەیەکی ئاسانتر راستییەکان جیابکەینەوە لە هەڵەو کەموکورتییەکان.

توێژەرانێك بۆ تۆماری مێژووی ئیسلامیی دەچنەوە سەر چەند سەرچاوەیەك کە ناحەزانی ئەم مێژووە تۆماریانکردووەو بە ئارەزووی خۆیان چۆنیان ویستووە لە شێوەی رۆمان و چیرۆکێکدا مێژووی ئیسلامییان خستۆتەڕوو، بەڵام دەبێت موسڵمانان دڵنیابن کە راستترین نووسینەوە بۆ مێژووی ئیسلامیی ئەو سەرچاوانەن کە زانایانی پێشوومان دڵسۆزانەو دادوەرانە تۆماریان کردوون بەبێ ئەوەی بکەونە ژێر فشاری دەسەڵات یان بەرژەوەندیی یان ئارەزووی خۆیان یان تەنانەت کینەی دەروونی، بەڵکو بەوپەڕی دادپەروەری و سپاردەکاری و کینە وەلانانەوە بڕیاری دادوەرانەیان داوە لەسەر دوژمنەکانیشیان، هەروەك کۆمەڵێکیان بە زیرەك و کۆمەڵێکی تر بە ئازاو هەندێکی تر بە سۆزدارو هەندێکی تر بە سەخاوەتمەندو هەندێکی تر بە داوێنپاك

و...هتد وەسفدەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا دوژمنی موسڵمانان بوون‌و خراپەیەکی زۆریان هەبووە بۆ موسڵمانان.

٣- مێژووی ئیسلامی تەنها مێژوویەکی سیاسیی نییە:

هەڵەیەکی گەورە لە نووسینەوەی مێژووی جیهانیدا بەگشتی‌و مێژووی ئیسلامی بە تایبەتی روویداوە کە بریتییە لە تۆمارکردنی مێژوویەکی سیاسی ئیسلامی‌و سەپاندنی بەسەر بوارەکانی تریداو پشتگوێ خستنی بوارەکانی دیکە کە ئەمە لە خۆیدا دەرکەوتنی ناڕێکی‌و کەموکورتی نووسینەوەکەیە ئەگەر بێتوو بوارەکانی تریشی لەگەڵدا نەبێت، چونکە لەڕاستیدا بوارە جۆربەجۆرەکانی شارستانییەتێك هەموویان پێکەوە کار دەکەنە سەر یەکتری با بوارێکیشی زاڵ بێت بەسەر هەموویاندا، رۆژهەڵاتناسان زیاتر سوودیان لەم هەڵە وەرگرتووەو توانیویانە روخساری مێژووی سیاسی بسەپێنن بەسەر مێژووی ئیسلامیدا تا ڕۆڵە کاریگەرو کاراکانی دیکەی مێژووی ئیسلامی بشاردرێتەوە، بەمەش ئامانجی سەرەکییان دێننەدی کە بریتییە لە بەکەم نیشاندان یان خراپ نیشاندانی مێژووی ئیسلامیی.

بەڵێ ئاساییە بۆ مێژوونووسانێکی رێژەیی کە بڵێن دەسەڵاتی موسڵمانان لە ئەندەلوسدا لاوازبوون‌و هێزیان تێکشکاوەو موسڵمانانیان هۆشمەندو بەهێزنەبوون تا لەبەردەم شاڵاوی خاچپەرستاندا خۆبگرن، بەڵام شتێکیان بیرچووە کە لە شاڵاوی خاچپەرستیدا بۆ سەر ئەو ناوچەیە (٨٠٠)هەزار نووسین هەبووە کە نزیکەی (٧٩٨)هەزاریان بەدەستی خاچپەرستان لەناوبراون.

دەی ئەو هەموو فرەلایەنییە چییە کە توانی شارستانێتییەك بنیادبنێت کە رۆڵەکانی بتوانن لە ناوچەیەکی سنورداری کەمدا ئەو هەموو نووسینە ئامادەبکەن یان ئەو شارستانێتییە گەورەیە بخەنەڕوو کە شوێنەواری ژیارێکی لەوێ بەجێهێشت.

بەڵێ ئەوە شتێکی دیارە کە مەیدانی سیاسی کاری خۆی دەکاتە سەر بوارەکانی دیکەی شارستانیەت، وەك بواری کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و ئایینی‌و فیکری‌و زانستی و...هتد.

بەڵام ئەی ئەگەر مەیدانی سیاسی لەناوچوو ئەو مەیدانانەی دیکەی ئەو شارستانێتیە چەندە خۆیان دەگرن‌و قەوارەی رۆحی شارستانێتیەکە دەپارێزن، واتە شارستانیەت تەنها بە مەیدانی سیاسیەوە نەبەستراوە، بەڵکو سیاسەت پایەیەکە لە پایەکانی شارستانیەت، بەڵێ راستە بە کەوتنی ئەو پایەیە گورزێکی گەورە بەر ئەو شارستانێتیە دەکەوێت، بەڵام ئەگەر ژیارەکە کارا بووبێت لەناوناچێت تا بوارەکانی دیکەش لەناونەچن.

کاتێك مەغۆل شاڵاویان هێنا بۆ سەر جیهانی ئیسلامی‌و قەوارەی سیاسی ئەو دەوڵەتەیان لەناوبرد، نەیانتوانی شارستانێتیی ئیسلامیی لەناوببەن، بەڵکو ئەو شارستانێتیە لە بوارەکانی دیکەوە هێندە بەهێزبوو توانی قەوارەی سیاسیی بەرامبەرەکەی بخاتە ژێر رکێفی خۆی‌و بیگۆرێت بە قەوارەیەکی سیاسی نوێ بۆ خۆی.

دەی ئەگەر ئەو بوارانەی دیکە هێندە کاراو بەهێزبن، چۆن دەکرێ لەبیربکرێن‌و بە بواری لاوەکی دابنرێن؟! ئایا دەتوانین بە مێژووی سیاسی موسڵمانان بڵێین مێژووی ئیسلامی؟ ئەی ئەگەر وابێت دەمێکە مێژووی ئیسلامی کۆتایی پێهاتووە، بەڵام خۆ هێشتا موسڵمانان قەوارەی رۆحی‌و کاریگەریی فرەلایەنەی خۆیان هەیە لەسەر جیهان بەگشتی بەجۆرێك لەبەرامبەر هەر لەمپەرێکدا خۆیان دەگرن‌و سەرلەنوێ خۆیان دێننەوە مەیدان، دەی بەدڵنیاییەوە لە مێژووی ئیسلامیدا هێزی سیاسی بەندە لەسەر هێزەکانی دیکەو وابەستەیە پێیانەوە نەك تاکە رۆڵی هەبێت.

ميَژووى ئيسلاميش بيَباكبووه لەوەى كە بە نەمانى هيَزە سياسيەكەى لەناوبچيَت، بەڵكو دەتوانيَت خۆى بگريَتەوەو سەر لەنوىَ قەوارەيەكى بەهيَزترى سياسيى دروست بكاتەوە.

٤ـ ئامانجى ميَژووى ئيسلامى بەرپاكردنى دەوڵەتى ئيسلامى بووە:

لە ئايينى ئيسلامدا كاركردن بە بىَ ئامانج نييە، بانگەوازيش كە كاريَكى ئيسلامييە ئامانجى پيَگەياندن‌و بنيادنانى كۆمەڵگەيەكى ئيسلامييە بۆ بەهيَزكردن‌و پاراستنى‌و بۆ بەرگرى لەوەيش هيَزى جيهادى بەكارديَت تا دەوڵەتى ئيسلاميى بە بوارە هەمەچەشنەكانييەوە دامەزريَت هەر لە بوارى پەرستشى تاكەوە تا پەيرەوى ياساى دەوڵەتى، بەواتايەكى پوخت (كتاب يهدى وسيف يحمى)(پەيامىَ بۆ ريَنموونى، چەكىَ بۆ پاراستنى پەيامەكە).

پەياميَك بۆ ريَنمايى‌و چەكيَك بۆ پاريَزگاريكردن‌و پەيرەوى پەيامەكە، ئەم جيَبەجيَكارييە بەشيَوەيەكى وردو دروست لە ژيانى پيَغەمبەر (ﷺ)و خەليفە راشيدينەكاندا بەدياردەكەويَت هەروەك سەرچاوە ميَژووييەكانيش شايەتى بۆ ئەوە دەدەن‌و شتيَكى حاشاهەڵنەگرە.

لەسەردەمى دواتريشدا هەمان ئامانج دەگيرايەبەر، بەڵام گرفت لەوەدايە لەهەنديَك بوارى ريَگەى گەيشتن بەو ئامانجە لادراوە، واتە ئامانج هەمان ئامانج دەبيَت، لە كۆمەڵگەو دەسەڵاتدا، بەڵام ريَرەوەكە هەڵە دەبيَت بەهۆى ئەوەى هەنديَك لە سەركردەكان خۆيان لەو ئامانجە جودا دەكەنەوە، هەنديَكيشيان لە ريَرەوى گەيشتنەكەى پيَغەمبەر ﷺ لادەدەن، بەڵام لەبەرئەوەى لادانەكە ريشەيى نەبوو بەخەسڵەتيَكى ديارەوە توانى بگاتە ئامانجە دەستنيشانكراوەكە كە بنياتنانى دەوڵەتى ئيسلاميى‌و بانگەوازكردنە بۆى.

دەکرێ هەندێ جار کەمینەیەك بە ئامانجی جیا لە ئامانجی سەرخشتنی پەیامی خوا چوونە مەیدانی جیهادەوە، بەلام ڕێرەوە گشتیەکە بۆ ئامانجی سەرخستنی پەیامی خوا بووە، یان جار بوویێت سەرکردەکە ئامانجی بۆ خوا نەبوویێت، بەڵام بەشداربوانی جیهادەکەو ئەنجامەکەشی لە سەرخستنی پەیامی خواییدا خۆیان بینیوەتەوە، واتە ئەو ئامانجە هێندە باوو زالْ بووە کە هاندەرەکانی تری لاواز کردووە.

بەشێوەیەکی گشتی ئەمڕۆش موسوڵمانان هەوڵو رەنجیان بەخەرجدەدەن، تاکە ئامانجیان بنیادنانەوەی دەوڵەتی ئیسلامییەو بەس، مەگەر کەمینەیەك نەبێت کە ئامانجیان بووەتە چاکسازییەکی کۆمەڵایەتی لەڕوانگەی ئیسلامەوەو بیریان لای دەوڵەت نییە، بەڵام ئەوانیش ئەوە بۆ بەهێزکردنی ڕێگەی دروستکردنی دەوڵەتی ئیسلامیی دەکەن، واتە گەراندنەوەی خیلافەت خەونێکی هەر موسڵمانێکی بەئاگای ئەم سەرزەوییەیە.

٥ـ مێژووی ئیسلامیی تەنها سەردەمی دەسەڵاتدارێتی ئیسلامیی نییە:

هەڵەیەك بەدیدەکرێ لای هەندێك کەس کە دەڵێن مێژووی ئیسلامیی تەواو بوو، یان وا باسیدەکەن لەدوای نەمانی دەسەلاتی ئیسلامی تەواوبوویێتو بوونی نەمابێت، هەندێك کۆتایی دەوڵەتی عەبباسی دادەنێن بە کۆتایی مێژووی ئیسلامیی، چونکە سەردەمی عوسمانی بە سەردەمی ئیسلامی دانانێن، هەندێکی دیکە دارمانی دەسەڵاتی عوسمانی بە کۆتایی مێژووی ئیسلامیی دادەنێنو دوای ئەوە ناخەنە قالبی مێژووی ئیسلامییەوە، لەڕاستیدا ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە ئەگەر سەردەمێك لە مەککەدا دەسەڵاتی ئیسلامی نەبوویێتو موسڵمانان تەنها لەهەوڵدابووین بۆ گەیاندنو سەرخستنی ئایینەکەیان، خۆ ناکرێت ئەو ماوەیە بە مێژووی ئیسلامیی دانەنرێت، یان سەردەمێك کە مەغۆل هات بۆ نێو دەسەڵاتی ئیسلامییو ڕوخاندیان ئایا ئەو سەردەمی

بێدەسەڵاتییە بە سەردەمی نێو مێژووی ئیسلامی دانانرێ؟ بەڵکو لە هەر سەرچاوەیەکی مێژوویی ئیسلامیدا باسی لێوەکراوە، بەهەمان شێوەش کاتێك دەسەڵاتی عوسمانی دادەڕمێو موسڵمانان بێ دەوڵەت دەمێننەوە، ناتوانین بڵێین ئەوە سەر بە مێژووی ئیسلامیی نییە، هەرکەسیش ئەوە بڵێت ئەوا کەوتۆتە گێژاوی نەبوونی شارەزایی لە مێژووەوە، چونکە هەر قەوارەیەك کاتێك مێژووەکەی کۆتایی پێدێت کە دەسەڵاتە هەمەچەشنەکانی بەتەواوی لەدەستبدات وەك دەسەڵاتی ڕۆحیو سیاسیو کۆمەڵایەتیو فیکری و...هتد.

٦ـ ناکرێ مێژووی ئیسلامی لەبوارە ڕۆحییەکەی جیابکرێتەوە:

زۆرکەس هەن بەچاوێکی ماددییەوە دەڕوانن بۆ هەموو شتەکان، لەوانەش ڕوانینیان بۆ مێژووی مرۆڤایەتی کە بەوپەڕی جیهانە ماددییەکەی دەروونیانەوە سەیری دەکەنو لێکدانەوەی بۆ دەکەن، بێئاگا لەوەی ئەو لێکدانەوەیە زادەی بەرهەمی دەروونی ئەو کەسانەیە نەك بڕیارێك کە مرۆڤایەتی بڕیاری لەسەردابێتو چەسپابێت.

ئەوەی خاڵی تێبینیە بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی باس لە شتێك کراوە کە بریتییە لە کاریگەریی دەروونی، یان هێزی پاڵنەری نەبینراو، یان هەر ناوێکی دیکە کە هەردەستەو کۆمەڵو کەسانێك ناوێکی لێدەنێن، گرنگ ئەوەیە هەموویان جەختدەکەنەوە لەسەر ئەوەی هێز یان لایەنێکی نەبینراو لەم بوارەدا بەشدارە.

مێژووی ئیسلامی بێبەش نەبووە لەو لایەنە نەبینراوە کە بە ڕۆحییەت ناوی دەبەن، ڕۆحیەتێك کە موسڵمانان کردوویانە بە کرۆکی هەوڵەکانیان، بەڵکو ئەو ڕۆحیەتەیە کە جەستە دەخاتەکار بۆ پێکهێنانی قەوارەیەکی ئیسلامی، پێدەچێت ئەوەی باوەڕی بە بەهەشتو دۆزەخو خۆشەویستی خواو پێغەبەرەکەی ﷺ نییە، گاڵتەی لێبێت کە کەسێك هەبێت گیانی بۆ ئەوە بەختبکاتو باوەڕی نییە بەو شتە، بەڵام بۆ موسڵمانان

ئاساییه بەماڵو گیانەوە خۆیان بکەنە قوربانی پێغەمبەر (ﷺ)و لە پێناویدا هەر هەوڵێ بدەن، بەڵکو لە پێناوی بەجێگەیاندنی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیدا ﷺ خەویان لەچاوانیان دەتۆراندو ماڵو وڵاتی خۆیان بەجێدەهێشت، هەندێك بۆ جیهادو هەندێکی تر بۆ زانستو بانگەواز، ئەمەش بە ڕوونی لە ژیانی زانایانی ئیسلامدا بەرچاو دەکەوێت.

بۆیە ئێمە ناتوانین کاتێك قسە لەسەر مێژووی ئیسلامیی دەکەین، بە لێکدانەوەیەکی سیاسی یان ماددی یان ڕێکردەیی یان...هتد لێکی بدەینەوەو بوارە ڕۆحیەتیەکەی لێ لابدەین، بەڵکو دیارە جیهادو فتوحات لەلای موسڵمانان بە پلەی یەکەم لەپێناوی بەرزکردنەوەی پەیامی خواو شەهیدبووندا دەکرێ، وەك ئەو هاوەڵەی کە باسی بەهەشتو ژیانی لای خواو نەمانی تاوانەکانی دەبیستێت، تەنها بە ئەو بیستنە ئامادەیە چەند دەنکە خورماکەی دەستی فڕێبداتو گیانی بخاتە سەردەستیو بیگێڕێت بە هەموو لایەکدا تا بەختی بکات لەپێناو خوای گەورەدا، بەڵکو موسڵمانان بەوپەڕی تامەزرۆییەوە ڕۆژانە نزای شەهیدییان دەکردو بێباکانەش بۆ وەرگرتنی زانستو گەیاندنی پەیامی خوا خەویان لە چاوانیان دەتۆراند بە مەبەستی چاوەڕوانی پاداشتی دواڕۆژ.

٧ـ دابەشبوونو مەزهەبگەرایی مێژووی ئیسلامی شلۆقکردووە:

کاتێك پێغەمبەر ﷺ پەیامی خۆی دەگەیەنێتو دواتر خەلیفەکانی راشیدین دێن، بەرەبەرە لە دوای ئیمامی عومەرەوە دەرگای فیتنە دەکرێتەوەو لەو دەرگای فیتنەیەوە بەڵایەك ڕوودەکاتە موسڵمانان کە بریتیە لە:

١ـ دابەشبوونی موسڵمانانو وەستان لەڕووی بەهێزبوونو فراوانخوازیو بەرەوپێش چوونیان، بەڵکو خوێن کەوتە نێوان موسڵمانانەوە.

٢- دەرکەوتنی دەستەگومڕاکانو هەندێك دەستەی لادەرو هەندێکی ناکۆکیش، ئەمانە کۆمەڵێکیان خۆیان لە ئایینی ئیسلام بردە دەرەوەو هەندێکیان لەسەر رۆحی ئایینەکە گیرسانەوەو هەندێکی تریش لە ئایینەکەدا مانەوە، بەڵام هەر چۆنێك بێت یەکڕیزی موسڵمانان تێکشکاو چەند ڕێگەیەك جودابوونەوە کە دوای ماوەیەك تێپەڕبوون نێوانەکەیان هێندە زیادیکرد کە هەرگیز بەیەك نەدەگەیشتنەوە.

٣- دەرکەوتنی مەزهەبگەرایی لەنێوان دەستە جیابووەکانیشدا، بەڵکو لەناو خودی ڕێگە بەردەوامەکەدا مەزهەبگەرایییەك ڕوویدا کە دواتر ئاکامی زۆر سەختو شلۆقی لێکەوتەوەو خوێنڕێژیو کینەو لێکدورکەوتنەوە پەیدابوو لە نێوانیاندا وەك نموونەی دیاری شاری بەغداد.

٨- مێژووی ئیسلامیی ناچێتە مازنەی بیروباوەڕی ئیسلامییەوە:

پێش هەرشتێك دەبێت ئەوەمان لەبەرچاوبێت کە بنەماکانی بیروباوەڕی ئیسلامیی لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ)دانرانو خوای گەورەش بڕیاری کامڵی لەسەردا ﴿..الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي..﴾.[1]

بۆیە ناتوانین بڵێین مێژووی ئیسلامیی بەشێکە لە بیروباوەڕی ئیسلامیی مەگەر ئەو قۆناغەی کە مێژووی ئیسلامەو قورئانو سوننەت دەستنیشانیان کردووە، نەك ئەوەی کە دواتر دێت.

ئەگەر قسەیەك کراو وترا خەلیفەیەکی ئومەوی یان عەبباسی یان عوسمانی هەڵەیەکی کرد، شتەکەش لە دیدی مێژووییەوە ڕاستبوو، ئەو کاتە ئەوە ناچێتە سنووری بیروباوەڕەوە کە بڵێین شتەکە وانییە ئەگەر نا بیروباوەڕمان زیانی لێدەکەوێت، بەڵکو

[1] - المائدة: ٣.

دەبێت دان بەو راستییەدا بنێین‌و دڵنیابین بیروباوەڕ لەوەدایە دان بنێین بە راستیدا وەك چۆن زانایان‌و مێژوونوسانی ئیسلامی وایانکردووە.

پێویستە ئەو دوو خاڵە لێکجودا بکەینەوە:

١- مێژوو پێوەرە بۆ بیروباوەڕ.

٢- بیروباوەڕ پێوەرە بۆ مێژوو.

ئێمە دەزانین بیروباوەڕی ئیسلامی قۆناغێکی تەواوی خۆی بڕیوەو کامڵە، بەڵام مێژوو لەڕێگەی بەردەوامی خۆیدایە، بۆیە دەبێت لەو کاتەدا بە پێوەرە تەواوەکە مێژوو بپێوین، واتە بۆ نموونە ڕووداوێکی مێژوویی دەهێنین‌و لەبەردەم تەرازووی بیروباوەڕدا پێوانەی دەکەین ئەو کات بڕیاری لەسەر دەدەین، واتە پاش دڵنیا بوون لەڕاستیی ڕووداوە مێژووییەکە، دەبێت بیروباوەڕ پێوانە بێت بۆ ڕووداوەکە.

٩- نەیارانی مێژووی ئیسلامی زۆرن:

با موسڵمانان‌و ناموسڵمانانیش هەموویان بە ڕوونی ئەوە بزانن کە مێژووی ئیسلامی نەیارانێکی زۆری هەیە، بەڵکو نەیارانی مێژووی ئیسلامی لەگەڵ جیاوازی نێوانی خۆیاندا ئامادەن کۆببنەوە لەسەر دژایەتیکردنی دوژمنی هاوبەشی سەرسەختیان، جا پێویستە لەسەر تاکی هۆشیار لە دیدی ئەو نەیارانەوە نەڕوانێتە مێژووی ئیسلامی، چونکە ئەوانە پێش ئەوەی مێژووی ئیسلامی بخوێننەوەو قسەی لەسەر بکەن، بڕیاری خۆیان داوە کە چۆن سەیری مێژووی ئیسلامی بکەن، بۆیە لەکاتی خوێندنەوەو شیکاری مێژووەکەدا لە جیاتی گەڕان بە دوای ڕاستیدا، ئامانجیان پاڵپشتیکردنی بڕیاری پێشینەیانە.

ئەمانە بەگشتی چەند بنەمایەك بوون بۆ چۆنێتیی ڕوانینمان بۆ مێژووی ئیسلامی، جا دەتوانین چەند بنەمایەکی تریش بێنینە پێش چاو کە لێرەدا باس نەکرابن.

# بەشی چوارەم
# مێژوونووسانی کۆن و نویٚ

خوێنەری مێژووی ئیسلامی یان باشتر بڵێین توێژەری مێژووی ئیسلامی پێویستە رەچاوی بەراوردی نێوان دوو جۆر لە مێژوونووسی تایبەت بە مێژووی ئیسلامی بکات، مێژوونووسانی پێشوو، مێژوونوسانی نویٚ.

مێژوونووسانی کۆن:

مێژوونووسانی کۆنیش دابەش بون بەسەر چەند دەستەیەکدا:

یەکەم: مێژوونووسانی ئەهلی سوننە: زۆرترینی مێژوونووسان لەم دەستەیەن، ئەمانە زیاترین تۆماری مێژوویان هەیە؛ بەلاٚم بە داخەوە بەردەوام تۆمەتیان ئاراست دەکرێت، لە دیارترین ئەو تۆمەتانەش کە هێناویانن:

١- ئەوانە پیاوی دەربارو دۆستانی دەسەلاٚت بون بۆیە بە ویستو خواستی دەسەلاٚتداران مێژوویان تۆمار کردووە، بۆیە هەر شتیٚ لە چاکەی دەسەلاٚتی ئیسلامی بڵێن ئەوە ناراستیەو بۆ بەرژەوەندی یان لە ترسی دەسەلاٚت یان بەهۆی دەمارگیرییان بۆ مەزهەبەکەیان نووسیویانە، بەلاٚم هەر ئەو کەسانە کاتیٚ لە نووسینی ئەم مێژوونووسانەدا کەموکورتیەکانی دەسەلاٚتی ئیسلامی بەدیدەکەن دەیهێنن‌و بەرامبەر بە هەموان بۆ لێدانی مێژووی ئیسلامی بەکاری دەهێنن.

٢- ئەو مێژوونووسانە دەمارگیری مەزهەبییان هەبووەو لەو پێناوەشدا ئەوەی پەیوەستی مەزهەبی خۆیان بووە لە کۆمەڵگەو دەسەلاٚتی ناو مێژووی ئیسلامیدا تۆماریان کردووەیان تەنانەت ئەگەریش نەبووبێت بۆان زیاد کردوە، هەرچیەکیش لە گەڵ مەزهەبیاندا نەگونجاو بووبێت بە سەختی لێیانداوە، با ئەو رووداوەش راستیەکی تەواو بووبێت.

٣- نووسینی ئەم کەسانە دووبارەکردنەوەی رای یەکترە نەك توێژینەوەی ورد لە شتەکە، واتە ئەوان رای بەرامبەرەکان وەرناگرن، بۆیە سیفەتی بڕیاری تاکلایەنە زاڵە بەسەریاندا.

بەڵام لەراستیدا ئەم تویجژەی مێژوونووسان زۆر ستەمیان لێکراوە، لە وەڵامی ئەو گومانانەندا دەڵێن:

١- ئەو مێژوونووسانە دوو جۆر بوون، جۆرێکیان چوونەتە ناو دەربارەکان نەك بۆ ماستاوچێتی یان بۆ بەرژەوەندی شەخسی، بەڵکو تا ببنە پالپشتی خێر بۆ دەسەڵاتداران، هەروەها تا نزیك بن لە راستی رووادوەکان، لەراستیدا بروای گەنیوسەیرکردنی دەسەڵاتو دوورگرتن لێی زیانێکی زری گەیاندووە بە موسڵمانان، چوکە ئەوە وادەکات کەسانی نەزان یان زانای نادڵسۆزو خراپ لەدەوری دەسەڵاتداراندا بن وەك واقیعی ەمرۆی جیهانی ئیسلامی، بەڵام زانایانی وسڵمان لە مێژووی ئیسلامیدا هاوسەنگییان لە دوورگرتنو نزیکبوونەوەدا پاراستووە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت(ما استخلف خليفة إلا له بطانتان : بطانة تأمره بالخير وتحضه عليه ، وبطانة تأمره بالشر وتحضه عليه ، والمعصوم من عصم الله)،[1] جا زانایانو مێژوونووسانی موسڵمانان هەوڵیانداوە ببنە پالپشتو کەسی نزیکی خێرو هاریکاری دەسەڵاتداران بۆ کاری چاکە، نموونەی ئەمەش.

---

[1] - صحيح البخاري، الرقم ٦٢٤٧، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٧٥٦٥، صحيح ابن حبان، الرقم ٦٢٨٣، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١١١٠٦.

هەندێکی تر لە زانایان دووریان گرتووە لە دەسەڵات وەك شەیخولئیسلام ئیبنتەیمیە کە گوتاری خۆی بە دەسەلاتو گەلیش گەیاند(من مولکی گەلم نەك دەسەلات)،[1] بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دوورگرتنی لە بەرژەوەندیە شەخصیەکاندا بوو، ئەگەرنا لە بەرژەوەندیە گشتیەکاندا دەچوویە لای دەسەڵاتدارانو لایەنی ڕاستیەکەی پێ دەوتنو هاریکاریان دەبوو بۆ پەیرەوی چاکەکە، تەنانەت لەو ڕێیەشدا بەرگەی ئازارەکانی دەگرت.

٢- ئەمەش وتەیەکی ناڕاستەو ستەمێکە لە هەوڵو ماندووبوونیان، بۆ نموونە دەبینین مێژوونوسێکی گەورەی وەك ئیبن کەپیر کاتێ دیەوێ قسە لەسەر حەلاج بکات ئەم هەنگاوانە دەگرێتەبەر:

یەکەم: هەوڵ دەدات ئەوپەری نیازی خۆی بۆ تۆماری ڕاستیەکان بخاتەڕوو دەڵێت(ونحن نعوذ بالله أن نقول عليه ما لم يكن قاله أو نتحمل عليه في أقواله وأفعاله)،[2] (ئێمە پەنادەگرین بە خوا لەوەی شتێکی بەناوەوە بڵێین کە نەیوتبێ یان شتێ زیاد بکەین لە گوفتارو کرداریدا).

دووەم: چی رای مێژووی تۆماری جیاواز لەسەر ژیانی هەیە دەیهێنێ تا تۆمارێکی ورد لەسەر ژیانی بخاتەبەردەست، بۆ نموونە دەڵێت(وكان يصابر نفسه ويجاهدها ولا يجلس إلا تحت السماء في وسط المسجد الحرام ولا يأكل إلا بعض قرص ويشرب قليلا من الماء معه وقت الفطور مدة سنة كاملة وكان يجلس على صخرة في شدة الحر في جبل

---

[1] - الحسامي: م.ن، ص٢٠٥.

[2] - ابن كثير:البدايتو النهاية، مكتبة المعارف، بيروت، ج١١، ص١٣٢.

أبي قبيس وقد صحب جماعة من سادات المشايخ الصوفية كالجنيد بن محمد وعمرو بن عثمان المكي وأبي الحسين النوري).[1]

سێیەم: رای هەریەك لەمانە وەردەگرێت لەسەری(زانایانی ئەهلی سوننە، زانایانی ئەهلی تەصەوف، کەسە نزیکەکانی وەك خەزووریو کوڕەکەیو...هتد).

چوارەم: بڕێ لە نووسینەکانی دەهێنێو ئاماژەش دەدات بە نووسینەکانی.

پێنجەم: دادگایی کردنەکەی دەهێنێو تۆمەتەکان لەبارەیەوەو بەرگریەکانی حەلاجیش لە خۆی دەهێنێ، باسی وردەکاری شێوازی کوشتنەکەشی دەکاتو دەرەنجامە جیاجیاکانی کوشتنەکەشی باس دەکات.

ئەمە لە کاتێکدایە ئیبن کەثیر سەر بە مەنهەجی ئەهلی سوننەو جەماعەیەو زۆر راجیایە لە مەنهەجێ کە حەلاج گرتبوویەبەر، کەچی بۆ باسی ئەو کەسایەتیە بەمجۆرە هەنگاو دەنێ.

سەبارەت بە رەخنەی سێیەم کە دەڵێن نووسینەکانی مێژوونووسانی ئەهلی سوننە یەکجۆرن ئەمەش بە راست نازانم، چونکە چەندین نوسین دەبینین تەواوکەری نووسینەکانی پێش خۆیانن، وەك زیاترینی ئەو ناونیشانانەی نووسراون(ذیل...).

بەشێکی تر لە مێژوونووسانی کۆن سەبارەت بە مێژووی ئیسلامی بریتین لە مێژوونووسانی دەستەو تاقمو مەزهەبەکان کە پشکی زیاتری ئەمانەش دەگەڕێتەوە بۆ شیعەکان وەك ئەبولفەرەجی ئەصفەهانیو مەسعوودی، ئەم کەسانەش لەگەڵ ئەوەی

---

[1] - المصدر نفسه، ج١١، ص١٣٢.

زۆرینەی گێڕانەوە مێژووییەکانیان هێناون، هاوکات لەبەرئەوەی نەیاری دەسەلآت بون بۆیە هەوڵیانداوە بە وردی جەخت بکەنەوە لە لایەنە سلبیەکانی ناو دەسەلآتی ئیسلامی.

مێژوونووسانی نویێ:

کێشە گەورەکە لێرەوە دەست پێ دەکات، کاتێ دەمارگیری سەرسەختانە لەنێوان راو مەزهەبەکاندا دەست پێ دەکات، ئەوانەی نەیاری مێژووی ئیسلامین بەو نەیاریەی پێشووی نەیارانی مێژووی ئیسلامی رازی نین، چونکە ئەمان لەمڕۆدا لەبەر قوڵبوونەوەی زیاتری داخیان ئامادە نین دان بنێن بە هیچ چاکەیەکی ئەو ئەزموونە چواردە سەدەییەدا، ئەوانەشی هەواداری ئەو مێژووەن لەبەر هێرشی زۆر ی نەیارانی مێژووی ئیسلامی پەرچەکردارێکی نارەوا نیشان دەدەن بەجۆرێ رازی نابن بە دانپێدانانەکانی مێژوونوسانی پێشووی هەوادار بە مێژووی ئیسلامی، ئەم جۆرەی ئەم نووسەرە تازانە بە تەواوی واتا هەوڵ دەدەن نووسینەکانیان پڕ بکەن لە شانازیەکانی مێژووی ئیسلامیو لە کونجێکەوە بە چەند دێڕێ هەندێ لە کەموکورتیەکانی مێژووی ئیسلامی باس بکەن، ئەمەش بە دڵسۆزیو هەوڵدان بۆ پێشرەوی بە کتێبخانەی ئیسلامی دەزانن.

بەلآم ئەم دیدو روانینانە زۆر کێشەن، چونکە هەر ئەم بارەیە وایکردووە بێمتمانەیی بە نووسینە مێژووییەکانی پەیوەست بە مێژووی ئیسلامی لای خەڵکێکی زۆر دروست بێت بەجۆرێ کاتێ هەوادارانی یەك لەو دوو رەوتە شتێك لە نووسینو پەیامی ئەوی دیکە دەبیستن سەرسام رادەمێنن چونکە خۆیان پێشتر شتی وایان نەبیستووە.

بەلآم سوپاس بۆ خوا خەریکە بەرەبەرە هەست دەکرێ بەم بارو تەنگژە سەختەو چەند هەنگاوێ نراونبۆ توێژینەوەی دروست کە زیاد لە پشت بەستن بە بڕیاری

پێشوەختە هەوڵ دەدەن بچنە ناو سەرچاوەکانەوەو بەپێی وردەکاری رووداوەکان مەسەلەکان بخەنە بەرباس، هەرچەندە تا ئێستاش بێلایەنبوون لە نووسینی مێژوویيدا لە دیدی زۆرینەدا بووە بە خەیاڵ پڵاوی.

# بەشی پێنجەم

## سەردەمەکانی مێژووی ئیسلامی

ئێمە ناتوانین لێرەدا وردەکاری سەردەمەکانی مێژووی ئیسلامی باس بکەین، بەڵام بە کورتی دیمەنی گشتی قۆناغەکانی مێژووی ئیسلامی دەخەینەروو تا ببێتە زانیاریەکی گشتی بۆ خوێنەری ئازیزو بەرچاورووونیەك بۆ خوێندنەوە سەبارەت بە قۆناغەکانی مێژووی ئیسلامی.

سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ):

ئەم سەردەمەش دابەش دەکرێت بەسەر چەند قۆناغێکدا:

یەکەم: قۆناغی پێش پێغەمبەرایەتی.

لەم قۆناغەدا پێغەمبەر(ﷺ)بە چەند بارێکدا تێپەڕ بوو، لەوانە:

❖ مردنی باوكو دایكو باپیری‌و نەبوونی هیچ خوشكو برایەك.

❖ کاری شوانەیی: بوارێکی دیارو بڵاوی ژیانی ئابووری ئەو سەردەمە بووە، پێغەمبەر (ﷺ) ئەم کاری شوانەییەی کرد تا یارمەتی مامی بدات، لەم کاری شوانەییەدا چەندین شت فێر بوو، وەك خۆڕاگری‌و لەسەرخۆیی‌و بەتوانابوون‌و سۆزداری‌و ...هتد.

❖ کاری بازرگانی: ئەبووتالیب هەوڵیدا پێغەمبەر (ﷺ) ببات لەگەڵ خۆیدا بۆ کاری بازرگانی تا فێری کاری بازرگانی ببێت، ئەمەش سەرەتای ئاشنابوون بوو بەو بوارە.

❖ بواری جەنگ‌و سەربازی: پێغەمبەر (ﷺ) لەو ماوەیەدا بەشداری جەنگی کرد.

❖ هاوپەیمانی‌و کاری سیاسی: وەك پەیمانی فضول.

پێغەمبەر (ﷺ) کاری شوانەیی دەکرد لە شاری مەککەدا، چونکە ئەوە کاری هەموو پێغەمبەرانی پێشوو بووە، بە دڵنیاییەوە قوتابخانەیەك کە هەموو پێغەمبەران تیایدا وانەیان وەرگرتبێ دەبێ قوتابخانەیەکی گرنگ بێت، چونکە شوان بە پێی ئیشەکەی کۆمەڵێ شت فێر دەبێ کە لە مەیدانەکانی تردا بەو جۆرە نییە.

شوان دەبێ ڕابکات بە شوێن مەڕو ماڵاتەکەداو خۆڕاگر بێ‌و کۆیان بکاتەوەو بیانپارێزێ‌و سۆزی هەبێت بۆیان، لێیان تێبگات‌و جوان پێیان بگەیەنێت.

دواتر کاری بازرگانی پێغەمبەر (ﷺ) کە لەبەر دەستپاکی‌و ڕاستگۆییەکەی جێی متمانە بوو، بۆیە خەدیجەی کچی خوەیلدی گەورە بێوەژنی دەوڵەمەند داوا دەکات لە پێغەمبەر (ﷺ) تا کاری بازرگانی بۆ بکات، پێغەمبەر (ﷺ) سوودێکی زۆری لێ وەرگرت لە ئاشنابوون بە باری ئابووری‌و بوارەکانی ژیانی گەلان‌و ناوچەکانی تر.

هەروەها لە بواری سەربازیدا پێغەمبەر (ﷺ) بەشداری دەکات لە جەنگداو یارمەتی مامەکانی دەدات لە کاتێکدا تەمەنی ١٥ ساڵە.

پێغەمبەر (ﷺ) لە پێگەی کۆمەڵایەتیدا زۆر بەهێز بوو، بەڵکو ببوو بە نموونە لە نێو خەڵکدا، خەڵکەکە بە ڕاستگۆو دەستپاك ناویان دەبرد، بۆیە لە زۆر بواردا پشتیان پێ دەبەست‌و ئەمانەتەکانیان لای ئەو دادەناو گرفتەکانیان دەبردە لای ئەو چارەسەریان بکات بۆیان، وەك گرفتی بنیاتنانەوەی کەعبە کاتێ کە قورەیش کەعبەیان ڕووخاند تا سەرلەنوێ نۆژەنی بکەنەوە، لە دانانەوەی بەردەڕەشی کەعبەدا گرفتیان بۆ دروست بووو هەر یەکەو دەیویست بە دانانی بەردەڕەشەکە پێگەی خۆی بەرز بکاتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) چارەسەری گرفتەکەی بۆ کردن‌و هەموان پێی ڕازی بوون.

لە مەڕ باس‌و خواسی ژنهێنانی پێغەمبەر (ﷺ) دەبینین بڵندی‌و شکۆداری کەسایەتی پێغەمبەر (ﷺ) وادەکات کە باری کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە لە بەرامبەر ئەودا

ڕۆڵ نەبینیو ئافرەتێك بەوپەڕی دەوڵەمەندیو ناودارییەوە داوا بكات تا پێغەمبەر (ﷺ) ڕازی بێت بە هاوسەرگیری نێوانیان كە ئەویش خەدیجەی كچی خوەیلد بوو، بە هاوسەرگیری نێوانیان باری ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) چاك بووو عەلی كوڕی ئەبوو تالیبی هێنا بۆ لای خۆی تا یارمەتی ئەبوتالیبی مامی بدات، هاوكات لە خەدیجەی خێزانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) خوای گەورە ئەم منداڵانەی پێ بەخشین: قاسم، زەینەب، ڕوقییە، ئوم كلثوم، فاطمة عەبدولا.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) ژیانی تەنهایی لا گرنگ بوو، بۆیە لە مانگی ڕەمەزاندا دەچوو بەرەو ئەشكەوتی حەڕاء لە دەرەوەی مەككەو لەوێ ژیانی تەنهایی دەبردەسەر.

**دووەم: قۆناغی مەككە:**

لەم قۆناغەدا سەرەتای بانگەوازی خوایی دەستی پێكرد، قورئان كە دەستووری خوایی بوو بۆ مرۆڤەكانو كۆتا كتێبی ئاسمانی بوو بۆ یەكەم جار دابەزیە سەر پێغەمبەر(ﷺ)، بە كورتی گرنگترین ڕووداوەكانی ئەم قۆناغە بریتی بوون لە:

❖ دابەزینی سروش بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ) لە ئەشكەوتی (حراء)داو بوون بە پێغەمبەری موحەممەدی كوڕی عەبدولا.

❖ سەرەتای بڵاوكردنەوەی بانگەوازی پێغەمبەرایەتیو موسڵمانبوونی چەند كەسێكی دەوری پێغەمبەر(ﷺ)و ماوەی سێ ساڵ بانگەواز بە نهێنی بوو.

❖ ئاشكراكردنی بانگەوازی ئیسلامیو زۆربوونی ڕێژەی موسڵمانانو هاوكات تووشبوونی موسڵمانان بە نارەحەتیو ئەو ئازارانەی بێباوەڕانی قورەیش تووشیان دەكردن.

❖ گەمارۆدانی سێ ساڵەی موسڵمانانو دواتر هەڵوەشانەوەشی.

❖ مردنی خەدیجەی دایکی باوەرداران‌و خێزانی‌پێغەمبەری خواو ئەبووتالیبی مامی پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەو دوو مەرگە نارەحەتیەکی زۆریان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دروستکرد.

❖ کۆچکردنی هەندێ لە موسڵمانەکان بۆ حەبەشەو گەیاندنی پەیامی ئیسلام بۆ دەرەوەی ناوچەکەو بڵاوبوونەوەی دەنگۆی بانگەوازی ئیسلامی.

❖ چوونی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ تائیف‌و ئازارچەشتنی‌و گەرانەوەی بۆ مەککە.

❖ بەستنی بەیعەتەکانی عەقەبەو دانانی سەرەتاکانی بنکەی ئیسلامی لە مەدینە.

❖ سەرەتاکانی کۆچکردنی موسڵمانان بۆ مەدینەو دروستکردنی یەکەم بنکەی دەوڵەتی ئیسلام.

سێیەم: قۆناغی مەدینە:

لەم قۆناغەشدا گرنگترینرووداوەکان بریتیبوون لە:

❖ بەردەوامی دابەزینی سروش بۆ سەر پێغەمبەر(ﷺ) تا کامڵبوونی ئایینەکە.

❖ دروستکردنی مزگەوت‌و کردنی بە بنکەی پەرستش‌و بنیادی تاک‌و کۆمەڵگەش.

❖ نەهێشتنی دووبەرەکیەکان‌و دروستکردنی برایەتی نێوان کۆچەران‌و پشتیوانان لەلایەک‌و ئاشتکردنەوەو بەبراکردنی ئەوسی‌و خەزرەجیەکان لەلایەکی ترەوە.

❖ دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی بە سەرکردایەتی پێغەمبەر(ﷺ)و دانانی دەستوور بۆ دەوڵەتکەو بەشداری پێکردنی ئەهلی کیتاب‌و دیاریکردنی ئەرک‌و مافەکانیان.

❖ دەستپێکردنی قۆناغی سەربازی موسڵمانان‌و ئەنجامدانی چەندین جەنگ‌و سەرکەوتنی موسڵمانان.

❖ هاوسەرگیریەکانی پێغەمبەر(ﷺ)و فراوانبوونی رۆشنبیریە فرەلایەنەکانی

موسڵمان بە ڕێنمایی پێغەمبەر(ﷺ).

❖ هەنگاونان بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلامیو گەیاندنی بە هەموو جیهان بە ڕێگەی ئاشتیانە کەئەویش لە ناردنی نامەکانی پێغەمبەردا(ﷺ)خۆی دەبینێتەوە بۆ سەرکردەکانی دەوڵەتانی دەوروبەری.

❖ بەرگرتن بە دەستدرێیە ناوخۆییو دەرەکیەکانو پێشوازی کردن لە موسڵمانبوونی بە لێشاوی هۆزو کۆمەڵەکان.

❖ کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ)و بەجێهێشتنی ئوممەتی ئیسلامی هاودەم بە قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ).

## سەردەمی خیلافەتی راشیدین

سەبارەت بە سەردەمی خیلافەتی راشیدین بەپێی ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) ماوەکەی دیاری کراوە کە دەفەرموێت(الخلافة بعدي في أمتي ثلاثون سنة)،[1] بەم پێیە ئەو ماوەیە ئەم پێنج خەلیفەیە لەخۆ دەگرێت(ئەبووبەکر، عومەر، عوسمان، عەلی، حەسەن)، پێغەمبەر(ﷺ) ئامۆژگاری موسڵمانانی کردووەو ڕێزو گرنگی قۆناغی ئەو خیلافەی خستوەتەڕوو دەفەرموێت(عليكم بسنتيء سنة الخلفاء الراشدين المهديين).[2]

گرنگترین باسوخواسەکانی ئەم ماوەیە لە چەند خاڵێکدا دەخەینەڕوو:

---

[1] - المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٣٤، صححه الألباني في صحيح و ضعيف الجامع الصغيرو زيادته، الرقم٣٣٤١.

[2] - رواه أبوداودء ابن ماجة والترمذي، صححه الألباني في صحيح ابن ماجة، الرقم ٤٢.

یەکەم: دانانی خەلیفە بۆ موسڵمانان تا هەم دووبەرەکی نەکەوێتە نێوان موسڵمانان، هەم بێ سەرکردەیی لەناو موسڵماناندا نەبێتە باو، هەم بەر بگیرێ بە هەر هەوڵێکی دەرەکی بۆ لەباربردنی یەکەم دەوڵەتی ئیسلامی سەرزەوی، بۆیە خێرا هاودەم بە وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) موسڵمانان لە کەپری ەنی ساعیدە کۆبوونەوە، پاش مشتومڕێکی هێمنانەو رێزبەخشانەو راگۆڕینەوەیەکی زانستی پڕ رێز هەموان یەکدەنگ بوون لەسەر ئیمامی ئەبووبەکر بە خەلیفەی پێغەمبەر(ﷺ)، لەوێ بەیعەتی پێدراو بۆ رۆژی دواتریش بە رەسمی لە مزگەوتدا بەیعەتی پێدرا، ئەوانەش یەکەمجار ئامادەی بەیعەتەکە نەبوون بەیعەتیاندا وەك ئیمامی عەلی.

زۆرێك لە نەیارانی مێژووی ئیسلامی ئەم یەکەم هەنگاوە دەکەنە تانەیەك بۆ مێژووی ئیسلامی‌و عەیبەیەك بەسەر هاوەڵانەوە، لەکاتێکدا ئەمە شانازیەکی گەورە بوولە یەکەم ئەزموونی دانانی سەرکردەدا بێ بوونی هیچ دووبەرەکی‌و ئاژاوەیەك لە ماوەی یەك رۆژدا سەرکردە دیاری بکرێت‌و هەموانیش پێی رازی بن، ئەوانەش یەکەم رۆژ ئامادەی بەیعەت پێدانەکە نەبوون سەرقاڵ بوون بە ترمی پێغەمبەرەوە(ﷺ)، ئیمامی عەلیش ئەگەر نارازی بوایە بەیعەتی نەدەدا، چونکە تەنها ئەگەر بیزانیایە ئەو لەپێشترە بۆ ئەو پۆستە بێدەنگ نەدەبوو لەو شیاوتر بوونە، بەڵکو دەیتوانی لەبەر نزیکی خزمایەتی لە پێغەمبەر(ﷺ) هەواداری زیاتر بۆ خۆی رابکێشێت ئەگەر مەسەلەکە ململانێی سیاسی بوایە، بەڵام ئیمامی عەلی زۆر رازی بوو لە ئیمامی ئەبووبەکرو سەرچاوەکانی مێژووش پڕن لە بەڵگەی روون لەو بارەوە.

دووەم: بەردەوامی دان بە چالاکیە سەربازیەکان‌و پارێزگاری لە سنووری ئیسلامی‌و بەرگرتن بە هەرەشە دەرەکیەکان، ئەو سوپایەی پێغەمبەر(ﷺ) بە سەرکردایەتی

ئوسامەی کوڕی زەید ئامادەی کردبوو دژیە رۆمەکان بەرێکراو سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

سێیەم: وەستاندنی بزوتنەوەی هەلگەراوەکان کە لە ئیسلام هەلّدەگەرانەوەو سەرلەنوێ هەولّیان دەدا بۆ چەند قەوارەیەکی سەربەخۆ، لەم میانەدا هەندێ بانگەشەی پێغەمبەرایەتیەکیان دەدا وەك موسەیلەمە، هەندێکیش هەولّیان دەدا سەرپشکی لە یوەوناچلێ پەیرەوکردنی ئیسلامدا بێننە مەیدان، بەلاّم دەولّەتی ئیسلامی توانی ئەو کێشەش لە کەمترین ماوەدا چارەسەر بکات.

چوارەم: کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئانی پیرۆز، بۆ ئەمەش هەنگاوی زۆر وردو هۆشیارانە گیرایەبەرو زەید ئەرکی سەرەکی ئەم کارەی گرتە ئەستۆ، بۆ ئەم کارەبڕێ مەرجی دانان‌و توانی بە جوانترین شێوە بیگەیەنێتە کۆتاو یەکدەنگی ئوممەتی ئیسلامی لەو بارەیەوە بپارێزێ‌و موعجیزەی خواییش لەو بارەیەوەهاتەدی(إنا نحن نزلنا الذكر وإنا له لحافظون)،[1] دواتر لەسەردەمی ئیمامی عوسمانیشدا نووسینەوەکان هەموو یەکخران‌و تەواوی جیهانی ئیسلامی یەکدەنگ بوون لەسەر ئەو نوسخەی قورئانە.

پێنجەم: فتووحاتی ئیسلامی، ئەمەش هەولّێك بوو بۆ گەیاندنی پەیامی ئیسلام بە ناوچەکان‌و فراوانخوازیەك بوو بۆ سنووری دەولّەتی ئیسلامی‌و بەشداری پێکردنێکی گەلانی تریش بوو بەو دەولّەتە بەرفراوانە ئایینیەو هەولّێ بوو بۆ رووخاندنی دەولّەتی فرەخودایی‌و پەرستشی دروستکراوەکان، دوور لەو تۆمەتەی بۆی دانراوە کە گوایە بەرژەوەندی ئابووری هۆکار بووە، ئەگەر ئەمە لای کەمینەیەکی بەشداربوان لەسەر ئاستی تاکەکەسی هەبوبێت بەلاّم لە رێژەوی گشتیدا ئامانجەکە ئایینی بوو نەك

[1] - الحجر: ٩.

ئابووری، وەك دەبینین دەوڵەتانی بەرامبەر ویستیان بە ماددە موسڵمانان رازی بکەن تا واز لەو نیازەیان بهێنن، بەڵام موسڵمانان تەنها ئامانج‌و بنەما سەرەکیەکانی چەمکی جیهادیان دەوتنەوە، بەم هۆیەوە دەوڵەتی کیسراکان رووخاو بەیتولمەقدیس فەتح کراو گورزی سەختوەشێنرا لە رۆمەکان، فتووحاتی میسریش لەو قۆناغەدا بوو.

شەشەم: رێکخستنە کارگێڕیەکان کە ئەمەش بریتی بوو لە رێکخستنی دیوانەکان‌و دیاریکردنی مووچەکان‌و بەشی دادوەری‌و لایەنەکانی تری دەزگاداری، لەوەشدا چاوپۆشی نەبوو، ئیتر بۆ سکالای تاکێکی کۆمەڵگە خەلیفە دەبرایە بەردەم دادگا، مووچە بۆ سەرجەم تاکەکانی ناو کۆمەڵگە دیاری کراو هەموو کەسێك لەگەڵ لەدایکبوونیدا مووچەی دیاریکراوی بۆ دادەنرا.

حەوتەم: ژیان لەم قۆناغەدا ژیانێکی ساکار بوو کە هەردەم هەوڵ دەدرا هاوسەنگی نێوان دنیاو قیامەت بپارێزرێ‌و مافی هەردووکیان وەك خۆی بدرێ، ئەم بروایە لە سەرکردایەتیەوە بۆ ناو کۆمەڵگە درێژبیوویەوەو بە گشتی کۆمەڵگە لەو بارەدا بوون، بەرەبەرەش باری ئابووری خەڵك بەرەو باشتر دەچوو،تێکەڵبوونی نەتەوەکان سەریهەڵداو جۆرێ لە تێکەڵاوی کۆمەلایەتی بەرچاو لەو قۆناغەدا بەدیدەکرێ، ئەمەش لەلایەکەوە بەهۆی چوونە ناو ناوچە فەتحکراوەکانەوە بوو، لەلایەکیشەوە چوونی موسڵمانبووەکانی ئەو نەتەوانە بوو بۆ ناو موسڵمانە عەرەبەکان، لە لایەکی ترەوە بردنی کۆیلەو کەنیزەکەکانی نەتەوەکانی تر بوو بۆ ناو موسڵمانانی نیمچە دوورگە، بە گشتی ژمارەی موسڵمانان تەواو روویلە زیاتر کردو سنووریشیان زۆر فراوانتر بوو.

هەشتەم: پێشخستنی سەربازی لەم ماوەیەدا زۆر بەرچاوە، لە لایەکەوە سوپای وشکانی رێکخراو پێشرەوی پێکراو لەو بوارەشدا سەربازگەکان دروست دەکران کە دواتر بوونە بنکە بۆ دروستبوونی شارەکان، هاوکات بواری سەربازی دەریایی دەستی

پێکردو لەگەڵ تازە دامەزرانیشیدا توانی لە جەنگی زاتوصەواریدا سەرکەوتن بەدەست بهێنێ.

نۆیەم: دیاردەی تیرۆرکردنی سەرکردە ئیسلامیەکان لەلایەن نەیارانی دەوڵەتی ئیسلامیەوە کە سەرەتا توانییان وەك هەوڵی یەکەمیان ئیمامی عومەر بکوژن، دواتر هەریەك لە ئیمامی عوسمانو عەلیش بەرکەوتن، هەوڵ درا بۆ کوشتنی هەریەك لە موعاویەو عەمری کوڕی عاصیش(ڕەزای خوا لە هەردووکیان)، بەڵام هەوڵەکەیان سەرکەوتوو نەبوو.

دەیەم: ڕوودانی فیتنەی نێوان هاوەڵانو دەرکەوتنی سەرەتای دەستە لادەرەکان لە دوای شەش ساڵ دەسەڵاتی ئیمامی عوسمانەوە بەدیدەکرێ، ئیتر لەوە بەدوا بۆ ماوەیەکی دیاری کراو شڵەژانێکی سەختی ناوخۆیی ڕوویکردە دەوڵەتی ئیسلامی کە دواجار لەسەر دەستی ئیمامی حەسەن چارەسەر کراو ئەو خوێن ڕژانەی وەستاند، بەڵام کێشەکە لەوەدایە زۆرترین تۆمەتو ناراستیەکان سەبارەت بەو قۆناغە تۆمارکراونو وای لێکراوە ئەو ماوە وەك زیاتر لە جەنگی نێوان دوو دەوڵەتی گەورەی ئەوکات باس دەکرێ، چاکترین نووسینێ سەبارەت بە وردەکاری مێژوویی لەو بارەیەوە توێژینەوەیەکی مێژوویە بە ناونیشانی((تحقیق مواقف الصحابة في الفتنة من روایات الإمام الطبري والمحدثین) لە نووسینی: أ.د. محمد أمحزون.).

بەراستی وردەکاری سەبارەت بەو ماوەیە زۆر پێویستە، بەڵام ئێمە وەك بەرچاوڕوونی لێرەدا تەنها وەك سەرەباس دە خاڵمان خستە بەردەست سەبارەت بەو ماوە مێژووییە، پێویستە خوێنەر بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکانی تایبەت بەو ماوەیە تا زانیاری تەواو لەو بارەیەوە وەربگرێ.

## سەردەمی ئومەوی

به گشتی مێژووی سەردەمی ئومەویش له چەند خاڵێکدا خۆی دەبینێتەوە:

یەکەم: گۆڕانی سیستەمی خیلافەتو لەبری ئەوەی خەلیفه بەپێی شوورا هەڵبژێردرێ دەسەڵاتی خیلافەت کرا به پاشایەتیو دەسەڵات وەرگرتن بوو به پشتاوپشت، پێشەنگی ئه م کاره لەلایەن ئیمامی موعاویەوه ئەنجام درا هەرچەنده ئەم سەرکردەیه بۆ داتانی یەزید ڕراوێژێکی زۆری کرد به زانایانو کەسایەتیه دیارەکان، بەلام ئیتر لەو کاتەوه تا ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی سیستەمی دەسەڵات گۆڕا به پشتاوپشت.

دووەم: فراوانبوونی مەیدانی کۆمەڵایەتی ناو ئەو دەوڵەته بەهۆی زۆری تێکەڵاوی نێوان نەتەوەکانو ژنو ژنخوازیو هەروەها فراوانبوونی مەیدانی فتووحاتەوە، بەلام ئەوەی جێی داخه پاش چارەکی یەکەمی ئەو دەوڵەته ئیتر دەمارگیری نەتەوەیی لەناو عەرەبەکاندا دەرکەوتو خۆیان به پێشرەوتر دەزانی، ئەمەش هەڵەیەك بوو که هۆکارێك بوو تا ئیتر زۆرێ له نەتەوەکانی تر دڵ نەدەن به عەرەبەکانو کینەو ناحەزی لەنێوانیاندا دروست بووو دواجاریش هۆکارێ بوو له هۆکارەکانی ڕووخانی دەوڵەتی ئومەوی.

سێیەم: بزووتنەوەی فتووحات لەم سەردەمەدا پێشرەویەکی تەواو بەرچاوی بەخۆیەوه دیو چەندین ناوچەی نوێ زیاد کران بۆ دەوڵەتی ئیسلامی، وێڕا فەتحکردنی خاکەکان فەتحی دڵەکانیش بەرفراوانی بەرچاوی بەخۆیەوەدی، له هەردوو بەرەی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواوه فتووحات قۆناێکی دیارو بەرچاوی بڕی، هەرچەنده له هەندێ قۆناغدا هەنگاوگەلێ نران که لێڵیەکیان دەدا به نیازو ئامانجی جیهادی ئیسلامیو بڕێ لادان له بنەماکان بەدیدەکرا، بەلام له ڕێرەوی گشتیدا ئەو دەوڵەته توانی خزمەتی

خۆی بۆ ئیسلامو موسڵمانان نیشان بداتو پەیامی جیهادی ئیسلامی بە پەیرەوی کاراوە بهێڵێتەوە، نموونەی هێرش بردن بۆ فەتحکردنی قوستەنتینیەش نموونەیەکی تاسەی ئومەویەکان بوو بۆ پەیرەوی جیهاد.

چوارەم: فراوانبونو پێشرەوی بەرچاو لە بواری زانستیدا روویدا، تا ئاستێ دەوڵەتی ئومەوی زانایانی گەورەی لەخۆدەگرت، بەڵام برێ ستەمیشیان بەرامبەر بە زانستو مەیدانی زانستی جیهانی ئیسلامی نیشاندا، ئەویش بەهۆی کوشتنی چەند زانای گەورەی ناو جیهانی ئیسلامیەوە، بەهەرحاڵ لە ماوەی ئەو دەوڵەتەدا نەك هەر مۆمی داگیرساوی زانست نەکوژایەوە بەڵکو پرشنگی تەواو زیاد کراو چەندین مۆمی تر داگیرسان، کردنەوەی خوێندنگە سەرەتاییەکان لە سەرەتای ئەم دەوڵەتەوە نیشانەی هەنگاونانی ئەودەوڵەتەیە بۆ پێشرەوی زانستی، هەروەها ئازادی زۆر دەدرا بە کەسانی سەرقاڵ بە بواری زانست، نموونەیەك لەوە وانەوتنەوەی حەسەنیبەصری بە بەرفراوانیو جیابوونەوەی ئیبن واصلی خوێندکاری کە بیری موعتەزیلی دامەزراند، کەچی هیچ جۆرە توندوتیژیەك بەرامبەر بەو لادانو دەرچوونە نەگیرایەبەر، بەڵام کاتێ لە سەردەمی عەبباسیدا موعتەزیلەکان بۆ ماوەیەکی زۆر کەم دەسەڵاتیان قۆستەوە کەوتنە تیرۆری فیکریو بیروباوەڕی دژ بە ئەهلی سوننە وەك بەندکردنو سزادانی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل.

پێنجەم: ململانێی نێوان ئومەویەکانو نەیارانی دەسەڵاتی ئومەوی لە مەیدانی ململانێی سیاسیو سەربازیدا چڕتر بوویەوەو بەرەبەرە ململانێکە چووە مەیدانی فیکریو بیروباوەڕیەوە، لەلایەکەوە جەنگی خەواریجو لەلایەکی تریشەوە جەنگی سەرسەختی نێوان شیعەو ئومەویەکان بوو، نموونەی دیارترین بەریەکەوتنە سەربازیەکان لەگەڵ ئومەویەکان بریتی بوون لە بزافی عەبدوڵای کوڕی زوبەیر، بزافی

حوسەینی کوڕی عەلی، برازاکەی موختاری ثەقەفی، برازای عەبباسیەکان کە توانییان دەوڵەتی ئومەوی بڕووخێنن.

شەشەم: شەهیدکردنی حوسەینی کوڕی عەلی بوو بە پەڵەیەك بە نێوچاوی ئومەویەکانەوە تا داخی دڵی شیعەکانبەرامبەر ئومەویەکان زیاتر بکاتو چەندبزاڤێکی ویستی تۆڵەسێنی دەرکەوتن کە دیارترینیان بزووتنەوەکەی موختاری ثەقەفی بوو.

حەوتەم: سەبارەت بە پێشرەوی ژیاری بە گشتی دەبینین ئومەویەکان ڕێکخستنی کارگێڕی وڵاتیان بەرەو پێش برد وەك دانانی دیوانی پوستەو وردەکاریەکانی، ڕێکخستنی دادوەریو دیوانی حەسبەو ئەوقافو چەندین بواری تر، بیناسازییان پێشرەوی زیادی کرد بەهۆی سوودوەرگرتن لە ئەزموونی گەلانی ترو کەتاتیبدا.

هەشتەم: دەرکەوتنی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لە نێوەندی سەردەمی دەوڵەتەکەدا گوڕپێدانەوەیەکی نوێ بوو بۆ درێژەدان بە تواناکانی دەوڵەتەکەو ڕاستکردنەوەی هەڵەکانو چاکسازیەکی بەهێز بەجۆرێ هێندێ هەستی ئەوەیان لا دروست بووە بە خەلیفەی پێنجەمی ڕاشیدی بزانن، بەڵام ئەوە ڕاست نیەو هەڵچوونێکی سۆزداریە، چونکە مەرجەکانی ڕاشیدی بوون لەو سەرکردە خواناسەدا نەبوون بەهۆی دووری ماوەکەیو لانەدانیشی لە سیستمی دەسەڵاتی پشتاوپشت.

بەهەرحاڵ ئومەویەکان ماوەیخۆیان تێپەڕاندو لە دادگای مرۆڤەکاندا بە چەندین شێواز دادگایی کراون، بەڵام دادگای ڕاستو دروست بریتیە لە دادگایی خوایی لە ڕۆژێکدا کە هەموو نهێنیەکان ئاشکرا دەبنو مافەکان دەدرێنەوە.

## سەردەمی عەبباسی

دیارترین خەسڵەتەکانی سەردەمی عەبباسی بریتین لە:

یەکەم: بەهێزی سیاسی عەبباسیەکان هەر لە سەرەتاوە، بەڵام دواتر بەهۆی لادان لە یەکدەسەلاتیو دەرکەوتنی دەوڵەتۆکەکان دەسەلاتیان لاواز بوو، ئیتر ماوەیەك بەهێزو ماوەیەکلاواز بوون، هەرچەندە چەند جارێ هەوڵ درا بۆ گەڕانەوە بۆ هێزی سەرەتای دەوڵەتەکە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون، بە گشتی دەوڵەتی عەبباسی لە ساڵی ١٣٢ تا ٦٥٦ دەسەڵاتی جیهانی ئیسلامییان بەڕێوەبرد تا دواتر لەسەر دەستی مەغۆلەکان لەنواچوون.

دووەم: پێشرەوی بێوێنەی زانستیو ژیاری لە سەردەمی عەبباسیدا بەجۆرێ بە سەردەمی زێڕین ناو دەبرێت، بەڵکو پێشەنگی باڵای پێشرەوی ژیاریو زانستی سەردەمی خۆی بوو، لەو سەردەمەدا زانا گەورەکان دەرکەوتنو زۆربەی هەرەزۆری زانایانی ئیسلامی لەو قۆناغەدا دەرکەوتن، هەر لەو سەرەدەمەدا زانایانی فەرموودە دەرکەوتنو فەرمودەکانیان نووسینەوە وەك بوخاریو موسلیمو مالیكو شافیعیو ئەحمەدو نەسائیو ترمزیو چەندینی تر، ئیتر ئەگەر سەدان لاپەرە تایبەت بکەین تەنها بە ناوهێنانی زانایانی ئەو ماوەیە هێشتا کەمە.

سەبارەت بە لایەنە ژیاریەکەشی پێویست دەکات دەیان بەرگ لەو بارەیەوە بنووسین، ئەگەر نا هیچ مافێکی نادەین، پێرەوی بەرچاوی بیناسازیو پزیشکیو خوێندنو کارگێڕیو بوارەکانی تر لە مێژووی ئەو دەوڵەتەدا زەقو دیار بەرچاو دەکەون.

سێیەم: ماوە فراوانی ئازادی سیاسیو بوونی فرەدەسەلاتی لە سەردەمی عەبباسیدا بە روونی بەدیدەکرێ، بۆ نموونە بوونی دەوڵەتۆکە کوردیەکان لەو سەردەمە، دەوڵەتی

غەزنەوی‌و سامانی‌و ئیدریسی‌و زەنگی‌و ئەیووبی‌و دەیانی تر نموونەن، ئەمە ئەگەر چی لەلایەکەوە خزمەت بوو بەو دەوڵەتە تا هەریەك لەو دەوڵەتانە بە گوڕو تینەوە خزمەتی خۆیان پێشکەشبکەن، لەلایەکی ترەوە دابەشبوونی دەوڵەتەکەو فرەئاغایی بوو.

چوارەم: لە چەند ماوەیەکی دەوڵەتی عەبباسیدا خەلیفەی عەبباسی تەنها نازناوو ڕێزی هەبوو دەسەلاتی کرداری لەدەست کەسانی تردا بوو، بۆ نموونە ماوەیەك تورکەکان بوونە خاوەن قەڵەمڕەوی کارا، دواتر بوەیهیە شیعە مەزهەبەکان بوون، دواتر سەلجووقیەکان هاتن، هەروەها زەنگی‌و ئەیووبیەکانیش دەسەلاتی زۆر بەرفراوان‌و کارایان لەدەستدا بوو، هەروەها مەملووکیەکان کە دواتر دەوڵەتی سەربەخۆیان دامەزراندو بوونە زیندووکەرەوەی دەسەلاتی ئیسلامی دوای دارمانی دەوڵەتی عەبباسی.

پاشان دەرکەوتنی دەوڵەتی شیعە مەزهەبی فاتیمی کە خیلافەتی جیای دژ بە عەبباسی ڕاگەیاند، زۆرێ لە تواناکانی دەوڵەتی عەبباسی کوشت بەڵام دواتر لەسەر دەستی صەلاحەدینی ئەیووبی ئەو دەوڵە فاتیمیە لەناوبرا.

هەروەها دەستەی ئیسماعیلیەکان‌و قەرمەیەکانیش هەبوون کە دەستەی تیرۆری پەیوەست بە مەزهەبی شیعە بوون، ئیسماعیلیەکان مانەوە تا دواجار لە سەر دەستی مەغۆلەکان بنکەی ئەلەمووتیان دەستی بەسەردا گیرا.

هەروەها دەوڵەتی ئومەوی لە ئەندەلوس هەبوو کە دانی نەدەنا بە دەوڵەتی عەبباسیدا، ئەم دەوڵەتەش توانی ماوەیەکی زۆر بەردەوام بێت‌و بە بەهێزی مایەوە.

پێنجەم: دەرکەوتن‌و بڵاوبوونەوەی زیاتری دەستەو بیرو مەزهەبە جیاجیاکان، ئەوانەی هەرکامەو بە جۆرێ جیا لە روانینێن ئەهلی سوننەو جەماعە بیریان دەکردەوە، لەوەشدا ئازادی تەواویان پێدرابوو، تەنانەت نووسینەکانی ئەوکاتیان کە

دەیاننووسین‌و بڵاویان دەکردنەوە تا ئەمڕۆش ماونەتەوە، وەك موعتەزیلەکان‌و صۆفیەکان‌و رەوتە فەلسەفیەکان، شیعەکان بە دیدو بەشە جیاجیاکانیانەوە، چەندین دەستەی تریش کە کاریگەرییان زۆر نەبوو.

شەشەم: زەقبوونەوەی مەزهەبگەرایی ناو ئەهلی سوننەو ململانێ نێوان مەزهەبەکانیان وایکردبوو بکەونە هەڵەی گەورەوەو زۆرجار سووکایەتی بە یەکدی بکەن تەنانەت کوشتارلەنێوانیاندا روویداو خوێنی یەکتریان رەوا دەکرد، دیارترین ئەو مەزهەبانەش مالیکی‌و حەنبەلی‌و شافیعی‌و حەنەفیەکان بوون، ئەگەر چی ئەو چوار زانایە لەسەردەمی عەبباسیدا بوون‌و هەر چواریان هیچ هۆکارێکیان دانەنابوو تا ئەو دژایەتیە دروست بێت، بەڵکو لە پەیرەوی ژیان‌و نوسینەکانیشیاندا هاوسۆزی‌و برایەی‌و رێزگرتنی یەکدی بەدیدەکرێ.

حەوتەم: دەرکەوتنی مەغۆلەکان مەترسیەك بوو بۆ جیهانی ئیسلامی، ئەو مەترسیەش بوو بە واقیع‌و مەغۆلەکان توانییان بەرەبەرە ناوچەکانی جیهانی ئیسلامی داگیر بکەن تا دواجار بەغدادی پایتەختی دەوڵەتی عەبباسییان داگیر کردو خەلیفەشیان کوشت، دواتریش مەغۆلەکان شامیان گرت‌و تاکە شوێنێك مابوویەوە بیگرن میسر بوو کە تیایدا مەملوکیەکان بڕیاری بەرگرییان دابوو.

## سەردەمی مەملووکی

ئەم سەردەمەش سەردەمی شانازیو سەرلەنوێ سەرکەوتنەوەی موسڵمانانە، تیایدا:

یەکەم: مەترسی مەغۆلەکان لەلایەن مەملوکیەکانەوە لەنوابرا، هەرچەندە مەغۆلەکان ببوون بە دوویەشەوەو هەندێکیان موسڵمان ببوون بەڵام موسڵمان بوونەکەیان پەیوەست بە ملکەچ بوون بە ئیسلام نەبوو، بۆیە مەملووکیەکان وازیان لێ نەهێنان تا دواجار سەرکەوتن.

دووەم: لەناوبردنی مەترسی خاچیەکان لەلایەن مەملووکیەکانەوە بوو کاتێ توانییان بەربگرن بە کۆتا شالاوەکانیانو لەلایەن سوڵتان بیبرسەوە گورزی کوشندە ئاراستەی خاچپەرستان کرا.

سێیەم: دەرکەوتنی چەندین زانای هەڵکەوتەو دیار کە کارێگەریو ناوو بەرهەمیشیان تا ئەمڕۆ درێژەیان هەیە وەك ئیمامی نەوەویو عیززی کوڕی عەبدوسەلامو شەیخولئیسلام ئیبن تەیمیەو ئیبن کەثیرو چەندینی تر.

چوارەم: لەم سەردەمەشدا مەزهەبگەرایی هەر باوبووو جۆرێ لە یەکتر نەخوێندنەوە هەبوو تەنانەت دادگاکان بەپێی مەزهەبەکان دابەش کرابوون، لە سەردەمی سوڵتان بیبرسدا یەکەم هەنگاو نرا تا هەر چوار مەزهەبەکە پێکەوە کارابنو هاریکاری یەکتر بن نەك تەنها مەزهەبێ زاڵ بێ.

پێنجەم: لە بوارەکانی تریشدا هەوڵ درا گەشە بدرێ بەوەی لە عەبباسیەکانەوە بۆیان بەجێماوە، چ لە بواری بنیاد یان کارگێڕی ین بوارەکانی ترەوە، مەملووکیەکان توانییان خزمەتێکی باڵا پێشکەش بکەن، بەڵام ئەوانیش وەك ئومەویو عەبباسیەکان سیستمی دەسەڵاتی پشتاوپشتیان پەیرەو دەکرد، هەروەها کوشتنی سەرکردەکان

لەلایەن نزیکەکانیانەوە لەناویاندا باوبوو، بەگشتی برێ ستەمو ناهەقی لە دەوڵەتەکەیاندا هەبوو، بەڵام خزمەتێکی زۆریشیان پێشکەش کرد.

## سەردەمی عوسمانی

یەکەم: بەگشتی دەوڵەتی عوسمانی دەوڵەتێکی جیهادی بووو هێزی سەربازی تیایدا لە بوارەکانی تری بەهێزتر بوو، عوسمانیەکان لە مەیدانی جیهادی ئیسلامیدا نموونەیەکی بەرچاوو خزمەتێکی باڵایان پێشکەش کرد، ئەوان توانییان ئەو سنوورانە ببڕن کە پێشت نەبڕابوون‌و بچنە ئەو خاکانەی کە پێشتر موسڵمانان نەچووبوونە ناویانەوە، خوا فەزڵی بەو دەوڵەتە بەخشی فەتحی قوستەنتینیە بکەن.

دووەم: بواری زانست لە سەرەتاوە گرنگی پێدەدرا، بەڵام لە دواییەکانی ئەو دەوڵەتەدا گەندەڵیەکی بەرچاو روویکردە بواری زانست‌و وای لێهات بروانامە دەدرا بە کەسێك کە ئەو خاك‌و وڵاتەشی نەدیبووو هیچ ئەو زانستەی نەخوێندبوو.

سێیەم: بواری نەتەوەیی لە سەرەتاوە نەکرابوو بە کێشەو گەل‌و نەتەوەکان بە برایانە پێکەوە دەژیان‌و هەموو گرۆو تینەکان درابوونە مەیدانی جیهادی، بەڵام لە دوو سەدەی کۆتاییەوە دەمارگیری نەتەوەیی‌و ستەم لە هەندێ گەل‌و زمان دەستی پێکرد، لەوانە ستەمێکی بەرچاو کرا لە گەلی کورد، چونکە بەرەبەرە بیری گەنیوی نەتەوەپەرستی رویکردە نەتوەکانی ناو جیهانی ئیسلامی‌و لە پێش هەموویشیانەوە تورك‌و عەرەب ئەو بیرەیان وەرگرت.

چوارەم: فەرموودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) هاتەدی سەبارە بە فەتحکردنی قوستەنتینیە، ئەوەبوو لەسەر دەستی سوڵتان موحەممەدی فاتیح شاری قوستەنتینیە

فەتحکرا، ئەوە موژدەیەکی گەورە بوو بۆ بەشداربوانیو شانازیەکیش بوو بۆ ئەو سەردەمەی عوسمانیو ئەو سوڵتانەش.

پێنجەم: کوشتنی کەسەکانی دەوری سوڵتان بەایبەت خزمانی لەلایەن سوڵتانەکانەوە شتێکی بلاو بوو، هێزو سوپایەکیش کە سەرەتا بۆ مەیدانی جیهاد دروستکران بەرەبەرە خوویان دایە ئارەزووی دنیاو ستەمو کوشتاری ناهەقیان دەستپێکرد.

شەشەم: مەزهەبی سۆفیگەرایی بە سەختی بلاوبوویەوەو دەوڵەتی عوسمانی داگرتەوە، ئیتر تەکیەو خانەقاکان بوونە بەدیلی خوێندنگەو کتێبخانەکانی جاران، بەڵام موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب لە حیجاز دەرکەوتو کۆبەرهەمی شەیخولئیسلام ئیبن تەیمیەی زیندوو کردەوەو بە هەموو توانایەوە هەوڵیدا سەلەفیەت بلاو بکاتەوەو ئەو ململانێیەش تا ئەمڕۆش ماوەو بزاڤی سەلەفیەت ڕۆژئاوای ڕۆژ لە پێشرەویدایە.

حەوتەم: رووخانی خیلافەتی ئیسلامی لە سەدەی بیستەمدا برینێکی سارێژ نەبووی موسڵمانانە کە تا ئەمڕۆش هەوڵی موسڵمانان بۆ ئەوەیە ئەو برینە سارێژ بکەنو بتوانن جارێکی تر خیلافەتی ئیسلامی بگێڕنەوە، بەڵام ئەمجار سەرلەنوێ لەسەر سوننەتی خەلیفە راشیدینەکان بێت، کەمال ئەتاتورک توانی بە هاوکاری هێزە دەرەکیەکانی ناحەز بە ئیسلام توانی سوودو دەرفەت وەرگرێ لە لاوازیو نەفامی موسڵمانانو بە یەکجاری دەوڵەتی ئیسلامی لەناوبەرێت.

## موسڵمانان لە سەدەی بیستی زاینیدا

بەگشتی دیارترین خەسڵەتەکانی سەردەمی نوێو هاوچەرخی موسڵمانان خۆی لە چەند خاڵێکدا دەبینێتەوە:

یەکەم: داگیرکردنی خاکی موسڵمانان لەلایەن بێباوەڕانو خاچپەرستانی نوێو جوولەکەکانو ڕەوتو بیرە ملهوڕیە هاوچەرخەکانەوە، بەجۆرێ گیانی موسڵمانان قوربانی درندەیی ئەوانو خاکی موسڵمانانیش تێرکەری هیوای چاوچنۆکانەی ئەوان بوو، داگیرکاران نموونەیەکی وایان پێشکەش کرد کە مێژووی درندەیی تازەلانیان کردە نموونەی ئەزموونی میهرەبانیو ڕەحمکردن بە یەکتر، هێندە بەسە نموونەی کوشتاری جەزائیر بکەینە بەڵگەی ئەو درندەییە.

دووەم: دابەشبوونی فرەلایەنەی موسڵمانان، لە لایەکەوە موسڵمانان لە رووی هزریو بیروباوەڕیەوە دابەش بوون بۆ چەند دەستەیەکو کەوتنە وێزەی یەکدی لەبری ئەوەی ببنە هەوادارو پاڵپشتی یەکدی، کەوتنە وێزەی یەکترو ئەزموونێکی تاڵی دژایەتی یەکتریان پێشکەش کرد، لە لایەکی ترەوە جیاوازی فیکری لەنێویاندا ڕوویداو هەریەکەو هەوڵی دەدا بیرکردنەوەو قەناعەتی خۆی بسەپێنێو بەرامبەر بە هەڵەو ناراست لەقەڵەم ربدات، زۆرجار لەبری گوێگرتن لە یەکدی بۆ جیاکردنەوەو ناسینەوەی حەقو ڕاستی دەکەوتنە هەوڵی ڕاسەپێنی، بەڵام سوپاس بۆ خوا هیواکانی یەکتر خوێندنەوە ڕوولە زیادبوونو زانایانیش لەو مەیدانەدا ڕۆڵی کارای خۆیان گێڕاوە.

سێیەم: دواکەوتەیی موسڵمانان لە ڕوانگەی زانستیەوە هۆکارێ بوو تا لەلایەکەوە سەرسام بن بە ئەزموونی دادگایی نەکراوی ڕۆژئاوا، لەلایەکی ترەوە سەری شەرمەزاری دانەوێنن بۆ برێ بەخششی زانستی ڕۆژئاوا، دەست بەتاڵی موسڵمانان وایکرد نەتوانن عەیبو هەڵەو شەرمەزاریەکانی ڕۆژئاوا بدەنەوە بە نێوچاوانیاندا.

چوارەم: بەردەوامی بزاڤی بەرگریکاری موسڵمانان ئاوی ناوچاوانی موسڵمانانی پاراست، لەلایەکەوە جیهادی بەردەوامی موسڵمانانو ملکەچ نەکردنیان بۆ داگیرکەر ئەزموونێکی پڕ شانازی بەخشی کە بەرهەمی زۆر چاکیشی هەبووو برێ سەروەری بۆ موسڵمانان گێڕایەوە، لە لایەکی تریشەوە بەرگریکاری هزری موسڵمانان هێندە بەهێز بوو کە توانی بە هێزی بانگەوازی ئیسلامی ئەمجار موسڵمانان ببنە هێرشبەرو بچنە خاکی دوژمنو دڵەکان فەتح بکەن، بەجۆرێ زۆربەی روانینەکان پێشبینی ئەوە دەکەن فەتحی ئاشتی رۆژئاوا لەلایەن موسڵمانانەوە رووبدات.

بەگشتی ئەمە روانینێکی کورتو گشتی بوو بۆ سەردەمەکانی مێژووی ئیسلامی، پێویستە خوێنەر زۆر بە وردی بکۆڵێتەوە لە هەریەك لەو قۆناغانە تا بتوانێ روانینێکی سەربەخۆو چاکتری هەبێت بۆ مێژووی ئیسلامی.

# بەشی شەشەم

# نموونەیەك لە ڕووداوێكی

# ناو مێژووی ئیسلامی

لێرەدا نەهاتوین نموونەیەكی بێ كێشەو پرشنگداری بەرچاوی ناو مێژووی ئیسلامی وەربگرین، بەڵكو نمونەیەكی بە ناشیرینو عەیبە سەیركراوی ناو مێژووی ئیسلامی بە نموونە وەردەگرین كە تا ئەمڕۆش پشكی زۆر گەورەی مشتومڕەكانی بۆ خۆی بردووەو لەو ڕووەوە تانەی زۆر دەدەن لە مێژووی ئیسلامی، ئەویش شۆڕشەكەی حوسەینی كوڕی عەلی بوو.

## شۆڕشەكەی حوسەینی كوڕی عەلی

هەوڵمانداوە لە چەند ڕوویەكەوە لەسەر ئەو شۆڕشە بدوێینو خوێندنەوەیەكی بۆ بكەین:

یەكەم: بارودۆخی سەدەی یەكەم.

دووەم: كەسایەتی حوسەینو یەزید.

سێیەم: ئامانجی شۆڕشەكەی حوسەین.

چوارەم: هەنگاونانی حوسەین بۆ شۆڕشەكە.

پێنجەم: هەڵوێستی جیهانی ئیسلامی.

شەشەم: هەڵوێستی دەوڵەتی ئومەوی.

حەوتەم: بە یەكگەیشتنی هاشمیو ئومەوی.

هەشتەم: شەهیدبوونی حوسەین.

نۆیەم: لایەنە ئیجابیو سلبیەكانی شۆڕشەكە.

## یەکەم: بارودۆخی سەدەی یەکەم:

سەدەی یەکەمی کۆچی سەدەی گۆڕانە ریشەییەکان بوو، هاتنی پێغەمبەری خواو گەیاندنی پەیامی کۆتایی بوو، تیایدا مەسیحیەتو جوولەکە لە جەنگێکی نێوان خۆیانو هێرشی دژ بە یەکەوە کەوتنە باری بەرگری دژ بە ئایینی نوێو یەکبوون لە دژی ئایینی تازەدا، دەسەڵاتە سیاسیەکانی فارسو ڕۆم کەوتنە بەر کوتەکی ڕاستکردنەوەی ئیسلامو ڕووخان، باری کۆمەڵایەتی لە فرەجۆریو شێواویو سنوربەزێنیەوە چوویە باری ڕێکخستنەوەو چەسپان، بانگەوازەکانی دادپەروەریو مافخوازیو جیهانێتیو یەکخواییو ڕاستڕەویی بوونە ڕێبەری بانگەوازنەکان، هەر لادانێك لەوانەش لە پێناو گەڕاندنەوەی جاهیلیەت یان لەقکردنی بناغەی حەقیقەتدا وەك هەوڵەکانی هەڵگەڕانەوەو زەکات نەدانو بانگەشەی پێغەمبەرایەتیو هتد لێیان دراو لەناوبران، ئیدی نموونەیەکی باڵای دەوڵەتی حەق لە سایەی ئیسلامدا لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) دەستی پێکردو دروست بووو دامەزراو لە سەردەمی خەلیفەکانیشدا چەسپا، بۆیە بچووکترین لادان لەو ڕەوتە ڕاستە گەورەترین دەنگۆی دەبوو، ئەوە بوو سێ ڕووداوی کوژرانی ئیمامی عوسمانو جەمەلو صفین گەورەترین دەنگۆیان هەبووو بوونە ئەزموونێکیش بۆ موسڵمانان بەڵام ژێر بە ژێریش هەوڵی دوژمنان بەردەوام بوون، وەك هەوڵەکانی جوولەکە بۆ زیندووکردنەوەی ڕۆحی نەتەوەو خێڵپەرستی، نانەوەی دووبەرەکی، گومانسازی. ئەوە بوو ئەو سێ ڕووداوی گەورە لە سەردەمی خیلافەتدا پاش بارشێوێنیەکانی سەردەمی ئیمامی ئەبوبەکر ڕوویاندا، بەڵام ئیمامی ئەبوبەکر تەواو بە دروستی بارەکەی ڕاست کردەوە، ئیمامی عومەر درێژەی پێدا، ئیمامی عوسمان کەوتەوە بەر گورزی دووەم هەوادارانی شەیتان، ئیمامی عەلیش بوو بە قوربانی دووەمی ئەو دوژمنانە، خێرا ئیمامی حەسەن هاتو لەگەڵ ئیمامی

موعاویەدا ڕێککەوت‌و بارەکە سەرلەنوێ ڕاست بوویەوە، بەڵام هێندەی نەبرد شێوانی سەر لەنوێی ئەو بارە بە زەقی دەرکەوت کاتێ بەیعەت بۆ یەزید وەرگیرا، هەرچەندە لە ئاستی تاکەکەسی یەزید پێش بەیعەت بۆ وەرگیرانی کەسێکی چاك بوو، بەڵام دواتر چەند هەڵەیەکی خۆی‌و کەسانی سەردەمەکەی ناویانلە مێژوودا بێزراو کرد.

وەك هەوڵێك بۆ بەرگرتن بە دەسەڵاتی یەزید حوسەین هەستاو لێنەوی بەو نیازەی ببێتە ڕێبەری چاکسازی بۆ ڕاستکردنەوەی بارەکە، بۆیە لەلایەکەوە ئامادەسازی بۆ خیلافەت دەکرد، لە لایەکیشەوە پرۆژەی چاکسازی دەخستە ڕوو، پرۆژەو چەکێ کە ڕێ نەدات ڕەوتی ڕێبازی ئیسلامی تووشی لادان بکرێ.

## دووەم : کەسایەتی حوسەینی کوڕی عەلی و یەزیدی کوڕی موعاویە :

أ- حوسەینی کوڕی عەلی: حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوتالیب کچەزای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو،[1] دایکی ناوی فاتیمەی کچی موحەممەد بوو،[2] لە ساڵی چوارەمی کۆچیدا لەدایك بوو،[3] ڕەیحانەو ئازیزو خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) بوو،[4] ئەو گەورەییانەی پێبەخشرا (کوڕی مژدە پێدراوێکی بەهەشت‌و ئامۆزاو زاوای

---

[1] - الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص٧٦.

[2] - أسد الغابة، ج٢، ص٢٥.

[3] - أسد الغابة، ج٢، ص٢٦.

[4] - صحيح البخاري، الرقم ٣٥٦٤، سنن الترمذي، الرقم ٣٧٨٨، صحيح ابن حبان،الرقم ٧٠٧٩.

پێغەمبەر (ﷺ)،[1] کچەزای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ڕەیحانەی پێغەمبەر (ﷺ)، دواتریش گەورەی گەنجانی بەهەشت،[2] دواجاریش شەهیدی ڕێی خوا) تەمەنی منداڵی لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)دا بردەسەر، نزیکی پێغەمبەر (ﷺ) بوو،[3] برای حەسەنی کوڕی عەلی بوو، ئەو حەسەنەی کە گەورەی گەنجانی بەهەشتو چاکسازی باری نێوان موسڵمانانو هاوشێوەترین کەس بە پێغەمبەر (ﷺ) بوو،[4] بەوەش لە کەمترین ماوەدا زیاترین فێرکاری ڕۆحیو ئیمانیو زانستی وەردەگرت، لەسەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدیندا نزیکی خەلیفەکان بووو لەلایەن زۆر خۆشەویست بوو، ئامادەی ساتەوەختەکانی شەهیدبوونی دوو خەلیفەی موسڵمانان بوو کە بە خەنجەری ناپاکی شەهید کران (عوسمانو عەلی)، لە سەردەمی حەسەنی برایدا هاودەمی ئیمام حەسەن بووو لە قسەی ئەو دەرنەدەچوو،[5] کونیەکەی ئەبوعەبدوڵا بوو،[6] دوای وەفاتی حەسەنی برای حوسەین بە سەردان دەچوو بۆ لای موعاویەو ئەویش ڕێزی زۆری لێ دەنا، دوای موعاویە و هاتنی یەزید حوسەین ئامادە نەبوو بەیعەت بدات بە یەزید چونکە خۆی بە شیاوتر دەزانی لە یەزید، بۆیە لێنەوی تا دواجار لەو پێناوەدا لەسەر دەستی سەربازانی یەزید شەهید کرا.[7]

---

[1] - أسد الغابة، ج٤، ص١٠٠.

[2] - الإصابة، ج٢، ص٧٦.

[3] - البدايتو النهاية، ج٨، ص١٥٠.

[4] - الإستيعاب، ج١، ص ٣٨٣-٣٨٦.

[5] - البدايتو النهاية، ج٨، ص١٥٠.

[6] - تأريخ الإسلام للذهبي، ج٥، ص٥.

[7] - البدايتو النهاية، ج٨، ص١٥١.

ب-یەزیدی کوڕی موعاویە: یەزید کوڕی موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیانە سەر بە ئومەویەکانە، دایکی ناوی مەیسونی کچی بەحدەلە، لە سەردەمی خیلافەتی ئیمامی عوسمان لە ساڵی ٢٦ کۆچیدا لەدایك بووە،[١] باوکی نووسەرەوەی وەحی بووەو لای پێغەمبەر ﷺ خۆشەویست بووە،[٢] یەزید سەرەتای ژیانی بە سەختی بەسەر بردووە چونکە موعاویە مەیسونی تەڵاق داوە، بۆیە یەزید لەگەڵ دایکی چووەو لەناو هۆزی کەلبدا لەگەڵ خاڵوانیدا ژیاوەو فێری سەختیو ناڕەحەتیەکان بووەو زمانپاراویو ئازایەتیو نەترسی وەرگرتووە،[٣] بەڵام دواتر دەچێتەوە لای موعاویەی باوکیو لەوێ زانستو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ لە باوکیەوە وەردەگرێت،[٤] موعاویە زۆر گرنگی دەدا بە پەروەردەی یەزیدو لە چەند بوارێکەوە پێیدەگەیاند، لەڕووی زانستەوە جگە لەوەی خۆی زانستی فێر دەکرد مامۆستایشی بۆ گرتبوو کاتێ خودی موعاویە داوای کرد لە دەغفەلی کوڕی حەنزەلە تا وانە بڵێتەوە بە یەزید،[٥] لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە فێری سەردانو تێکەڵی دەکرد لەوانە بۆ پرسەی ئیمامی حەسەن یەزیدی نارد بۆلای ئیبن عەباس،[٦] لەڕووی سەربازیەوە بەشداری پێدەکرد لە هەڵمەتی موسڵماناندا بۆ فتوحاتی ئیسلامی،[٧] لەڕووی کارگێڕیشەوە لە نزیکی خۆی دایدەناو فێری بوارە

---

[١] - المنتظم، ج٥، ص٣٢٢.

[٢] - أسد الغابة، ج٥، ص٢٢١.

[٣] - الصلابي: الدولة الأموية، ج٢، ص

[٤] - البدايتو النهاية، ٨، ص٢٢٦.

[٥] - المعجم الكبير، ج٤، ص٢٢٦.

[٦] - البداية والنهاية، ج٨، ص٢٢٨.

[٧] - تأريخ الطبري، ج٣، ص٢٠٦.

کارگێڕیەکانی دەکرد وەك ئەرکی حەجی ساڵێکی پێ سپارد،[1] تا دواجار بەیعەتی بۆ وەرگرت تا دوای خۆی ببێت بە خەلیفەی موسڵمانان.

یەزید بەشداری هێرشی موسڵمانان بۆ فەتحی قوستەنتینیە بووو لە دووەم هێرشدا بۆ سەر قوستەنتینیە کە لە سەردەمی موعاویەدا ڕوویدا ئەو ڕێبەری سوپاکە بووو گەورە هاوەڵانیش لەناو سوپاکەیدا بوون لەوانە ئەبوئەیوبی ئەنساری کە لەوێ شەهید بوو.[2]

یەزید لە سەردەمی دەسەڵاتیدا سێ هەڵەی گەورەی ئەنجامدا (شەهیدبوونی حوسەین لەسەر دەستی سەربازانی سوپاکەی، جەنگی (الحرة)و لێدانی شاری مەدینە، لێدانی بزاڤەکەی عەبدوڵای کوڕی زوبەیرو جەنگ بردنە ناو مەککە)،[3] دواجار لە ساڵی ٦٤ کۆچیدا[4] لە تەمەنی سیو هەشت ساڵیدا مرد.[5]

---

[1] - البدايتو النهاية، ج٨، ص٢٢٩.

[2] - سير أعلام النبلاء، ج٤، ص٣٦.

[3] - البدايتو النهاية، ج٨، ١٧٢ – ٢٢٦.

[4] - سير أعلام النبلاء، ج٤، ص٣٦، ٤٠.

[5] - شذرات الذهب، ج١، ص٧١.

## سێیەم: ئاما نجی شۆڕشەکەی حوسەین:

حوسەین لە سەردەمی باوکیدا هاوڕاو هاوڕێی باوکی بوو، کاتێ دوو جەنگی ناحەز هاتنە ڕێی ئیمامی عەلی کە جەنگی جەمەلو صفین بوون، جەنگی جەمەل نزیك بوو ڕوونەداتو ئیمامی عەلیو دایکمان عائیشەو تەلحەو زوبەیر گەیشتنە ڕێکەوتن، بەڵام بکوژانی ئیمامی عوسمان کە سەری مارەکە بوون ڕاچڵەکینو جەنگەکەیان هەڵگیرساند،[1] لە جەنگی صفیندا کە لەگەڵ ئیمامی موعاویە بوو دواجار گەیشتنە ڕێککەوتن لەسەر وەستاندنی جەنگەکە،[2] لە هەردوو بارەکەدا حەق بە تەواوەتی لای ئیمامی عەلی بووو ئیجتیهادەکەی هەریەك لە دایکمان عائیشەو تەڵحەو زوبەیرو موعاویەش نەیپێکا، ئیمامی حوسەینیش لەگەڵ باوکیدا بووو ئەو بارەی دەدی، بەڵام ڕای بەسەر ڕای باوکیدا نەبوو، لەدوای باوکیشی لەگەڵ ئیمامی حەسەنی برایدا بووو لەوەشدا حەقی تەواو بۆ ئیمامی حەسەن بوو چونکە بەیعەتی پێدرا بوو، ئیمامی حوسەینیش پشتگیری بوو، بەڵام کاتێ حەسەن تەنازولی کرد لە دەسەڵاتی خۆی بۆ موعاویە تا موسڵمانان یەکبخات[3] حوسەینیش لە ڕای حەسەنی برای لای نەدا، چونکە یەکڕیزی موسڵمانانی لا گرنگ بوو، هەروەها حەسەنی برایشی داوای لێکرد هیچ نەکات، بۆیە لە سەردەمی ئیمامی موعاویەشدا بێدەنگ مایەوەو یەکڕیزی موسڵمانانی پاراست.[4]

---

[1] - البداية والنهاية، ج٧، ص ٢٣٨-٢٣٩.

[2] - تأريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص٥٣٧-٥٤١.

[3] - الوافي بالوفيات، ج١٢، ص٦٨.

[4] - تأريخ الإسلام للذهبي، ج٥، ص٦.

بەڵام کێشەکە لەو کاتەوە سەری هەڵدا موعاویە بەیعەتی وەرگرت بۆ یەزیدی کوڕی، بۆ ئەمەش راسەپێنی نەکرد، بەڵکو رای زۆرێك لە هاوەڵانو کەسانی وەرگرت،[1] ئەوەبوو موعاویە بەیعەتی وەرگرت بۆ یەزیدی کوڕی تا دوای خۆی ببێتە خەلیفەی موسڵمانان، لەمەدا ئیتر حوسەین بەیعەتی نەداو ئەوەی بە هەڵە دەزانیو بڕیاریدا ئەو بارە ڕاست بکاتەوە، بۆیە دەتوانین بڵێین ئامانجەکەی حوسەین بریتی بوو لە:

(هەوڵدان بۆ گێڕانەوەی ئەزموونی خیلافەتی راشیدین، هەروەها ئەو پێی وابوو یەزید شیاوی ئەو پۆستە نیە، بۆیە پێشنیاری ئەوە بوو لە بری یەزید خۆی ببێت بە خەلیفە، واتە ئامانجی دووەمی شۆڕشەکەی حوسەین گەیشتن بوو بە پۆستی خیلافەت)، لە ئیسلامیشدا تەنها لە یەك باردا دروستە بەڵکو پێویستە داوای پۆست بکەیت، کاتێ کەسێکی شیاوو بەتواناو لەبار ببینێ پۆستێکی گرنگ دەدرێ بە کەسێکی نەشیاو بەو پۆستەو لە ئەنجامدا گەندەڵی دروست دەبێت ئەو کات ئەو کەسە گونجاوە بۆی هەیەو تەنانەت لەسەری پێویستە داوای ئەو پۆستە بکات نەك بۆ حەزو ویست بەڵکو بۆ ئەرکو ڕێ ڕاستی پاراستن.

ئیمامی حوسەین پێی وابوو زۆر ترسناکە بێدەنگ بێ لەو گۆڕانکاریەی ئەنجامدراوە، هەرچەندە شیعەکان لەوەدا تەواو تێکەوتوون کە وا ئامانجەکەی حوسەین هەوڵدان بووە بۆ هەمان کاری یەزید، بەڵام ئەم بۆ هاشمیەکانی بکات.

دوور روانین هەیە بۆ شۆڕشەکەی حوسەین: رایەکیان پێی وایە ئەو شۆڕشەی حوسەین کردی لە ئامانجو لە ئەنجامیشدا شکستی خوارد، رایەکیش پێی وایە گەورەترین ئامانجو باڵاترین ئەنجامی هەبوو.

---

[1] - الصلابي: الدولة الأموية، ج٢، ص

مەسەلەیەکی تری گرنگ لێرەدا ئەوەیە ئایا ئەم ئامانجەی حوسەین هەیبوو لای هاوەڵانی تر هەبوو یان نا؟ لە وەڵامدا دەڵێین هەردەستەو بۆ ئەو بارە ئیجتیهادێکیان هەبوو، دەستەیەکیان ئەوەیان بە گۆڕینی شوورا نەدەزانیو پێیان وابوو ئەو کارەی ئیمامی موعاویە تەنها بۆ یەزیدەو یەزیدیشیان بە کەسێکی خراپ نەدەزانی، دەستەیەکی تریان پاراستنی یەکبوونی موسڵمانانیان لەلاگرنگتر بوو تا بتوانن بە ئارامیو بە هێواشی ڕێگە پێشینەکە بپارێزن، چونکە ماوەیەکی کەم بوو لە فیتنەی نێوان موسڵمانان ڕزگاریان ببوو حەزیان نەدەکرد دووبارە خوێن برژێ، کەسی وەك عەبدوڵای کوڕی زوبەریش وەك ئیمامی حوسەینی کردو دواتر ئەویش ڕاپەڕیو شەهید کرا.

## چوارەم: هەنگاونانی حوسەین بۆ شۆڕشەکە:

حوسەینی کوڕی عەلی لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجەکەیدا چەند هەنگاوێکی بنەڕەتی نان کە بریتی بوون لە:

یەکەم: بەیعەت نەدان بە یەزید: ئەم خاڵە زۆر گرنگە چونکە زۆر کەسی وا هەن خێرا بڕیاری ئەوە دەدەن ئیمامی حوسەین لەو شۆڕشەیدا لە بنەڕەتی شەریعەت دەرچووەو لە فەرمانی ئیمام لایداوە، بەڵام ئێمە دەزانین حوسەین هەر لە بنەڕەتدا بەیعەتی نەدا بە یەزید.[1]

دووەم: بانگەوازکردن بوو بۆ کۆکردنەوەی خەڵك لە دەوری خۆی کاتێ لە عێراقەوە لێنەویو ئەوە بوو خەڵکی کوفەی بانگهێشت کرد بۆ ئەوەو دواتریش لە حیجاز دەچوویە لای هاوەڵانو بانگهێشتی دەکردن بۆ ئەوەی لەگەڵی لێنەوێن تا ئەو بارە

[1] - تأريخ الإسلام للذهبي، ج٥، ص٥، شذرات الذهب لابن العماد الحنبلي، ج١، ص٦٦.

بگۆڕن، بەڵام هاوەڵان هەریەکەو لەو بارەوە ڕایەکی جیاوازیان هەبوو، حوسەینیش بە بینینی ئەو ڕاجیاوازیو ئامادەنەبوونانە ساردنەبوویەوە.[1]

سێیەم: ئامادەکاری بۆ گرتنەدەستی دەسەڵاتو بەیعەت وەرگرتن، ئەوەشی لە عێراقەوە دەستپێکرد،[2] ئەمەش لایەنێکی سلبی بوو لە شۆڕشەکەی حوسەیندا، چونکە خەڵکی عێراق پێشتر پشتی هەریەك لە عەلیو حەسەنیان بەرداو شکاندنیان دوای ئەوەی پێشتر ئەوان ئەو دوو خەلیفەیان هاندەدان، ئیمامی حوسەین ئەزموونی پێشتری بە هەند وەرنەگرتو پشتی بەست بە خەڵکی عێراق، ئەوە بوو ئەویشیان بە ئاقاری باوكو براکەیدا برد، بەڵکو خراپتر لەوەش بە کوشتیان دا.

ئەوە بوو حوسەین نامەیەکی نووسی بۆ خەڵکی کووفەو دای بە موسلیمی ئامۆزایو تیایدا بە خەڵکی کوفەی گەیاند:

(من براو ئامۆزاو جێ متمانەی ناو کەسانی خۆمم نارد بۆلاتانو فەرمانم کردووە باری ئێوەم بۆ بنووسێو بزانێ قسەو ڕاتان چیە، ئەگەر بۆی نووسیم ڕای گەورەو زۆرو دیارتان بەو جۆرەیە کە نێردراوتان پێی وتمو لە نامەکەتاندا خوێندمەوە پشت بە خوا دێم بۆلاتان).

بەوجۆرە موسلیمی ڕاسپارد تا بچێو لەوێ بەیعەتی بۆ کۆبکاتەوە، موسلیمیش چووو بە نهێنی بەیعەتی بۆ کۆکردەوەو نزیکەی دوانزە هەزار کەس لە خەڵکەکە بەیعەتیان پێدا، ئینجا هەواڵی نارد بۆ حوسەینو داوای لێکرد بچێت بۆ کووفە چونکە خەڵکەکە لە پشتی ئەون،[3] بەڵام لێرەدا نوعمانی کوڕی بەشیر خەڵکەکەی ئاگادار

---

[1] - البداية والنهاية، ج٨، ص١٥٢، ١٥٩.

[2] - البداية والنهاية، ج٨، ص١٥٢-١٥٦.

[3] - البداية والنهاية، ج٨، ص١٥٢.

کردەوە ئەو کارە نەکەن ئەگەر نا لێیان دەدات، هەرچەندە ئەوەشی کرد بەڵام یەزید نوعمانی لابردو عوبەیدوڵای کوڕی زیادی هێنا کە زۆر ڕەق‌و توند بوو.[1]

حوسەین کەوتە خۆئامادەکردن تا بە خۆی‌و ماڵ‌و منداڵ‌و خێزان‌و کەسەکانیەوە بەرەو کووفە بکەوێتە ڕێ،[2] چوونی لەو جۆرەش واتە چوونە بۆ سەقامگیری‌و مانەوە لەوێ نەك سەردانێکی کاتی‌و گەڕانەوە، بە واتایەکی تر بنکە داکوتان لە کووفەو وەرگرتنی بەیعەت‌و هەنگاونانی نوێی بۆ شۆڕشەکە.

## پێنجەم: هەڵوێستی جیهانی ئیسلامی:

سەبارەت بە هەڵوێستی جیهانی ئیسلامی لەو بارەدا پێنج هەڵوێستی سەرەکی بەدی دەکەین:

١- هەڵوێستی ئومەویەکان کە دوای ئەم باسە بەجیاو بە وردی باسی دەکەین.

٢- هەڵوێستی هاوەڵان: ئەوە بوو هاوەڵان کە بەوەیان زانی حوسەین بەنیازە بڕوات هەر کامەو بەجۆرێ هەوڵیان دەدا ڕێ بگرن بە ڕۆیشتنەکەی، چونکە وا دەرەنجامی ئەو کارەیان دەهاتە پێش چاو سەرکەوتوو نەبێ، هەندێ ئەوەیان دەگێڕایەوە بۆ لاوازی ئامادەسازیەکانی حوسەین، هەندێ دەیانگێڕایەوە بۆ توندی‌و ڕەقی ئومەویەکان، هەندێ دەیانگێڕایەوە بۆ متمانە نەبوونیان بەوانەی حوسەین لە عێراق پشتی پێ دەبەستن، ئەوە بوو موحەممەد ئیبنولحەنەفیەی برای داوای لێکرد نەچێ بۆ کووفەو پێی باش بوو بچێ بۆ مەککەو لەوێوە دەست پێ بکات تا ئەگەریش

---

[1] - البداية والنهاية، ج٨، ص١٤٦-١٥٣.

[2] - تأريخ الإسلام للذهبي، ج٥، ص٩.

سەرنەکەوت ڕێیەکی ڕزگاری هەبێ،[1] ئیبن عەباس داوای لێکرد نەچێت بۆ عێراق بەڵکو ئەوان بانگ بکات بۆ حیجاز، چونکە ئەوان ناپاك دەبن بەرامبەری، هەروەها دواتر پێشنیاری بۆ کرد لەبری کووفە بچێ بۆ یەمەن چونکە ئەوێ هەم هەواداری عەلی باوکی لێیەو هەم دوورە دەسە تا بتوانێ ئامادەسازی بکات، هەم شوێنی خۆشاردنەوەی زۆرە، کاتێکیش حوسەین سوور بوو لەسەر چوونی ئیبن عەباس داوای لێکرد کەسوکارو منداڵەکانی نەبات،[2] ئەبووسەعیدی خودریش داوای لێکرد نەچێت بۆ کووفە چونکە ئەو لە عەلی باوکی بیستبوو کە باسی خراپی کووفیەکانی دەکرد،[3] عەبدوڵای کوڕی زوبەیریش داوای لێکرد نەچێ بۆ کووفەو لە مەککەوە لێبنەوێ‌و ئەوانیش بەیعەتی بۆ کۆدەکەنەوە،[4] ئیبن عومەریش هەوڵیدا ڕێ بگرێ بە چوونی حوسەین‌و سێ ڕۆژ ڕێی بڕی ئینجا گەیشت بە حوسەین‌و داوای لێکرد نەچێت،[5] کە خواحافیزیشی لێکرد خواحافیزی کوژرانی لێکردو باوەشی پیاکرد،[6] چەندین هاوەڵی تریش هەمان هەوڵیان دا، بەڵام حوسەین سوور بوو لەسەر ڕۆیشتن‌و ئامادە نەبوو بڕیارەکەی بگۆڕێت.

٣- هەڵوێستی خەڵکی عێراق: ئەوە بوو ئەوان حوسەینیان هانداو بە بەڵێنە درۆکانیان موسلیمیان لەخشتە برد، بەڵام کاتێ ئومەویەکان ڕەقیبیان نواند پشتیان کرد لە قسەو بەیعەتی خۆیان.[7]

---

[1] - تأريخ الإسلام للذهبي، ج٥، ص٩.

[2] - تأريخ الطبري، ج٣، ص٢٩٥، الكامل في التاريخ، ج٣، ص٤٠٠-٤٠١.

[3] - البداية والنهاية، ج٨، ص ١٦١، تأريخ الإسلام للذهبي، ج٥، ص٥-٦.

[4] - الكامل في التاريخ، ج٣، ص٣٩٩-٤٠٠.

[5] - البداية والنهاية، ج٨، ص ١٦٠.

[6] - تأريخ الإسلام للذهبي، ج٥، ص٨.

[7] - البداية والنهاية، ج٨، ص١٥٢-١٥٦.

٤- خەڵك شام: ئەوانیش بەگشتی پشتگیرو هەواداری ئومەویەکان بوون‌و قسەیەکی وایان لەو بارەیەوە نەبوو.

٥- خەڵکی ناوچەکانی تری وەك یەمەن‌و شوێنانی تری ئیسلامی بێدەنگ بوون‌و تەنانەت ئاگاداری ئەو مەسەلەیە نەبوون تا ئەوەی ڕوویدا ئینجا هەواڵیان پێگەیشت.

بەمجۆرە دەبینین بە شێوەیەکی گشتی هەڵوێستەکان لەگەڵ حەزو ویستی حوسەیندا نەدەگونجان، بەڵام حوسەین تازە بڕیاری خۆی دابوو، هەرچەندەش عەبدوڵای کوڕی جەعفەر لای والی مەدینە ئەمانی تەواوی بۆ وەرگرت بەڵام حوسەین سوور بوو لەسەر چوونی.[1]

## شەشەم: هەڵوێستی دەوڵەتی ئومەوی

سەبارەت بە هەڵوێستی دەوڵەتی ئومەوی ئەوا خۆی لە چەند ڕوانگەیەکدا دەبینێتەوە کە ئەوانیش بریتین لە:

یەکەم: یەزیدی کوڕی موعاویە: یەزید بەرامبەر بە دەرچوونی حوسەین بەرەو کووفە دوو هەڵوێستی بنەڕەتی گرتەبەر، یەکەمیان لەناوخۆی دەوڵەت دا، دووەمیش لەسەر ئاستی کەسایەتی. سەبارەت بە ناوخۆی دەوڵەت ئەوە بوو ئیبن زیادی نارد تا کاروباری کووفە بگرێتە دەست‌و هەنگاوی خێرابنێ بۆ بەرگرتن بەو بارەو هاوکاتیش هۆشیاری پێدا لە هاتنی حوسەین بۆ کووفە،[2] لەسەر ئاستی کەسایەتیش ئەوە بوو نامەی نارد بۆ ئیبن عەباس کە وەك گەورەو ڕیش سپی بنەماڵەی پێغەمبەر (ﷺ)و

---

[1] - الكامل في التاريخ، ج٣، ص٤٠٢.

[2] - البداية والنهاية، ج٨، ص ١٦٥.

زانای دیارو گەورەی مەدینە سەیردەکراو داوای لێکرد بەربگرێ بە دەرچوونی حوسەین، ئیبن عەبباسیش لەلایەکەوە هەواڵی پێگەیاند کە هەوڵی داوەو ئەنجامی نەبووە، لەلایەکیشەوە هەوڵیدا گومانی چاکە لای یەزید دروست بکاتو وتی گومان نابەم حوسەین لە چاکە زیاتر نیازی شتێکی تری هەبێ بۆ دەرچوون بۆ ئەوێ تا بەوە هەم هەواڵ بدات کە ئەو دەرچووەو پێی بڵێ وریابە هەنگاوی دروست بنێیت بەرامبەری چونکە ئەو نیاز پاکە.[1]

سێیەم: والی مەککە: عەمری کوڕی سەعیدی کوڕی عاص کە هەواڵی دەرچوونی حوسەینی بیست خێرا وەفدێکی نارد بۆ لای حوسەینو یەحیای برایشی کردە سەرۆکی وەفدەکە تا هەوڵ بدەن پاشگەزی بکەنەوە، بەڵام کاتێ حوسەین سوور بوو لەسەر چوونەکەی بەم ئایەتە وەڵامی دانەوە ﴿لِي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ﴾.[2]

چوارەم: والی کووفە: نوعمانی کوڕی بەشیر کە والی کووفە بوو هەوڵیدا ڕێ بگرێ بەو کارەی موسلیم تا نەهێڵێ حوسەین بێتو جەنگ ڕوونەدات، بۆیە موژدەو هەڕەشەی پێکەوە خستەڕوو، بەڵام ئامادەنەبوو یەك هەنگاوی توند بنێ، بۆیە یەزید لەو پۆستەی لایبردو ئیبن زیادی لەبری دانا.[3]

پێنجەم: مەروانی کوڕی حەکەم: مەروان گەورەیی‌و ڕێزو پایەی حوسەینی لەبەرچاو بووو خێرا نامەی نووسی بۆ ئیبن زیادو هۆشیاری پێدا کە وریای جموجوڵی بێ

---

[1] - البداية والنهاية، ج٨، ص ١٦٤.

[2] - تاريخ الطبري، ج٣، ص٢٩٦.

[3] - الإصابة، ج٢، ص٧٩.

بەرامبەر کچەزای پێغەمبەری خواو سەرەنجامی خراپی هەر جووڵەیەکی هەڵەی بۆ خستە پێش چاو، بەڵام بەداخەوە ئیبن زیاد گوێو چاوی دڵی کەڕو کوێر بوو بوون.[1]

شەشەم: ئیبن زیاد: هەنگاوە سەختو مەترسیدارەکە لەلایەن ئەم کەسە ستەمکارو دڵڕەقەوە نرا، ئەو هەر لە سەرەتاوە بڕیاریدا بەهێزو گورز بەر بەو شۆڕشە بگرێ، بۆیە خێرا کە کاروباری کووفەی گرتەدەست کەوتە هەنگاونان بۆ لێدانی بزاڤەکەی حوسەینو ئەم هەنگاوانەی گرتەبەر:

١- دزەکردنە ناو ڕێکخستنەکەی موسلیمو دواجار گرتنی موسلیمو هانیئی پەناردەریشیو گەورە هاریکاریەکانیو کوشتنیان بە بەرچاوی خەڵکەوە تا ترسو بیم بنێتەوە،[2] تەنانەت هەردووکیانی لەخاچدا.[3]

٢- کۆکردنەوەی هۆزو خێڵەکانی دەوروبەر لە دەوری خۆی بۆ چواردەور دانی خۆی بە هەواداری خۆی.

٣- سەربەخۆ هەنگاوناںو وەرنەگرتنی وردەکاری هەنگاونان لەلایەن یەزیدەوە تا هیچ نەرمیەك نەبێتە ئەگەر.

بەمجۆرە دەبینین هەموو هەڵوێستەکانی دەوڵەتی ئومەوی دووربوون لە نیازی جەنگو خوێن ڕشتنو بەزاندنی سنوری ڕێزو گەورەیی حوسەین جگە لە هەڵوێستی توندو درندانەی ئیبن زیاد کە بە زمانو کردەوەش کوشتنی حوسەینو شۆڕشەکەی حوسەینی دەڕازاندەوە.

---

[1] - تاريخ الإسلام للذهبي، ج٥، ص١٠.

[2] - الكامل في التاريخ، ج٣، ص٣٩٨.

[3] - الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤ص٤٢.

## حەوتەم: بەیەکگەیشتنی هاشمی و ئومەوی:

حوسەین لە دەی زولحەجەی سالّی شەستدا لە مەککەوە بەرەو کووفە کەوتە رێ،[1] هەرچەندە وەفدو نامەکان دەگەیشتنە لای بەلاّم سوور بوو لەسەر چوونەکەی، ئیبن زیادیش لەولاوە بەردەوام هەنگاوی دەناو لەملاو لەولاوە هێزو هێزەکانی رێکدەخست تا لە یەکەم چرکەدا گورزی کوشندەی خۆی بوەشێنێ.

لە رێگەدا حوسەین گەیشت بە فەرەزدەق، هەوالّی کووفەی لێ پرسی، فەرەزدەق وتی (دلّی خەلّك لەگەلّ تۆیەو شمشێریان لەگەلّ ئومەویەکانەو قەزاش لە ئاسمانەوە دادەبەزێ)، دواتر ئیمامی حوسەین بەردەوام بوو لە چوونی بەرەو کووفە.[2]

کاتێ حوسەین ماوەیەکی تر چوو نوێنەرێکی نارد بۆ لای موسلیم تا هەوالّ بزانێ، بەلاّم کەسێکی سەر بە ئیبن زیاد بەناوی حوصەینی کوڕی تەمیم گرتیو بردی بۆ ئیبن زیادو ئەویش کوشتی،[3] حوسەینیش نەوەستا تا هەوالّی بۆ بهێنێتەوە بەلّکو بەردەوام چوو تا گەیشتە ناوچەی (زبالە)، لەوێ هەوالّی کوژرانی موسلیمی پێ گەیشتو زانی ئەوانەی بەیعەتیان پێدابوو بەیعەتەکەیان لە زمانیان زیاتر تێنەپەڕیبوو،[4] عەلی ئەکبەری کوڕی داوای لێکرد تا بگەڕێتەوەو نەچێت بۆ کووفە، بۆیە حوسەین داوای کرد کێ ئامادە نیە بچێت بگەڕێتەوە، ئەوکات خەلّکێکی زۆر کە لەدەوری بوون بلاّوەیان کرد، بەلاّم هەندێ لە دەوری مانەوەو تکایان لێکرد بگەڕێتەوە چونکە لە

---

[1] - تأريخ الإسلام للذهبي، ج٥، ص١٠.

[2] - البداية والنهاية، ج٨، ص ١٦٦.

[3] - تأريخ الطبري، ج٣، ص ٣٠٣، البداية والنهاية، ج٨، ص ١٦٨.

[4] - البداية والنهاية، ج٨، ص١٥٩.

کووفه پاڵپشتی نەماوە، بەڵام برایانی موسلیم وتیان بەخوا هەر دەبێ تۆڵەی براکەمان بکەینەوە یان وەك ئەو دەکوژرێین.[1]

پاش ماوەیەکی تری ڕێ بڕین گەیشتن بە یەکەم دەستەی سوارەی هێزەکانی ئیبن زیاد بە ڕێبەری حرری کوڕی یەزید کە وتی داوام لێکراوە بتبەم بۆ کووفە، بەڵام تۆ نە بڕۆ بۆ کووفە نە بگەڕێرەوە بۆ مەدینە، بڕۆ بۆ شوێنێکی ترو دواتر پەیامت بنێرە بۆ یەزید یان ئیبن زیاد،[2] ئیمامی حوسەین نامەو پەیامی داواکاری خەڵکی کووفەی پێ نیشان دا، بەڵام ئەو نکوڵی لەوە کرد. حوسەین داوای کرد ڕێ بدات بگەڕێتەوە بەڵام ئەو بەوەش ڕازی نەبوو، حوسەینیش ڕازی نەبوو بچێ، دواجار ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی حوسەین ڕێگەکەی بگۆڕێو نەچێتەوە مەدینە، ئەویش ڕێی بەرەو شام گۆڕی، حەرریش هەر لەگەڵی بووو حوسەینیش نوێژی بۆ هەردوو هێزەکە دەکرد.[3]

## هەشتەم: شەهیدبوونی حوسەین

کاتێ حوسەین گەیشتە کەربەلا گەیشت بە دەستەی سوارەی عومەری کوڕی سەعد هاودەم بە بەشیرو حوصەین، ئەو سوپایە بە نیازی جیهادی دەیلەم دەچوون کەچی ئیبن زیاد بە هەڕەشە ناچاری کردن بچن بۆ لێدانی حوسەین، دوای دانووستان عومەر نامەی نووسی بۆی و پەیامی حوسەینی پێگەیاند، بەڵام ئیبن زیاد ئەوەی بە هەوڵی خۆڕزگارکردن داناو مەرجی دانا دەبێ حوسەین بەیعەت بدات بە یەزید، بەڵام حوسەین ڕازی نەبوو بەیعەت بدات ئەویش لەباری ترسدا، بۆیە سێ دواکاری بۆ خستەڕوو:

---

[1] - تأريخ الإسلام للذهبي، ج٥، ص١١، الإصابة، ج٢، ص٨٠-٨١.

[2] - الصلابي: الدولة الأموية، ج١، ص٤٨٠.

[3] - المنتظم، ج٥، ص٣٣٥، الكامل في التاريخ، ج٣، ص٤٠٧.

١- بگەڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی.

٢- بچێ بۆ شام‌و خۆی یەزید ببینێ.

٣- بچێ بۆ سەنگەرێکی سەر سنوری ئیسلامی بۆ جیهاد.[1]

عومەریش ئەوەی گەیاند بە ئیبن زیاد، ئیبن زیاد حەزی بە ڕای دووەم بوو، بەڵام شیمر چووە بنکلێشەی‌و هەر سێ داواکەی پێ بەرپەرچدایەوە،[2] بۆیە بێ ئەنجامێکی ڕێککەوتن لە ڕۆژی هەینیدا حوسەین بە سی‌و دوو سوارو چل پیادەو لە دوایشیەوە ژن‌و منالّی داناو بڕیاری جەنگی دا، بەردەوام لە هاوەڵەکانی شەهید دەبوون‌و کەس لە سوپای ئومەوی نەیدەوێرا لە ترسی سزای خوا حوسەین بکوژێ، حوسەینیش ئامادە نەبوو خۆبەدەستەوە بدات، شیمر هاواری کرد بیکوژن، ئەوەبوو چەند کەسێك لێیانداو دواجار شەهیدیان کرد،[3] لەگەڵ حوسەیندا ژمارەیەك لە براو کوڕو کەسە نزیکەکانی شەهید کران، براکانی بریتی بوون لە(عەبباس‌و جەعفەرو عوسمان‌و موحەممەو ئەبوبەکر)، لە کوڕەکانیشی عەلی‌و عەبدوڵاو ئەبوبەکرو قاسم شەهید بوون، تەنها زەینولعابدین مایەوە.[4]

شەهیدبوونی حوسەین لە ساڵی شەست‌و یەکی کۆچیدا بوو.[5]

دواتر ژن‌و منداڵەکان هێنران‌و بەجیا دانران‌و مووچەو خۆراك‌و جلیان بۆ دابین کرا پێچەوانەی ئەو ڕایەی شیعە کە دەڵێن بە کەنیزەك گیران بەڵکو یەزید بردنی بۆ لای

---

[1] - تأريخ الإسلام للذهبي، ج٥، ص١٣-١٤، الاصابة، ج٢، ص٨١.

[2] - تأريخ الإسلام للذهبي، ج٥، ص١٤.

[3] - أسد الغابة، ج٢، ص٢٨-٢٩.

[4] - المنتظم، ج٥، ص٣٤٠.

[5] - شذرات الذهب، ج١، ص٦٦.

ژن‌و منداڵانی خۆی‌و نەیهێشت کەس نیازی خراپی بەرامبەریان هەبێ، هەروەها چی پێویستی هەبوو بۆی دابین کردن، ئیتر ئەوە لە پەشیمانی بێت یان لە فێڵزانی بوو بێت، دواتر کەسوکاری حوسەین گەڕانەوە بۆ مەدینە.[1]

یەزید خۆی ماڵئاوایی لێکردن‌و سامانێکی زۆرو جلو بەرگو پێویستی بۆ دابین کردن، پاشان بە عەلی کوڕی حوسەینی وت(قبح الله بن سمية أما والله لو أني صاحب أبيك ما سالني خصلة إلا أعطيته إياها ولدفعت الحتف عنه بكل ما استطعت ولو بهلاك بعض ولدي ولكن الله قضى ما رأيت)،(خوا ابن سمیە ناشیرین‌و بێزراو بکات، دە سوێند بەخوا ئەگەر من لای باوکت بوومایە چی لێ داوا بکردمایە پێم دەبەخشی، بە هەموو تواناشمەوە بەرم دەگرت بە کوشتنی با تەنانەت لەو ڕێیەشدا هەندێ لە منداڵەکانم لەناو بچوونایە، بەڵام قەزای خوا وابوو کە بینیت).[2]

لێرەدا کۆمەڵێ ڕا هەن کە دەڵێن یەزید حەزی بە کوشتنی حوسەین نەکردووەو هەندێ بروبیانووی بۆ دێننەوە، بەڵام لە ڕاستیدا یەزید تەنها لە یەك باردا حەزی بە کوشتنی حوسەین نەبوو ئەویش ئەو کاتەی حوسەین نەیاری نەبێت، ئەگەر نا پێویستی نەدەکرد ئیبن زیادی دڵڕەق‌و خوێنڕێژ دابنێ لە کووفە لەبری نوعمانی کوڕی بەشیر کە زۆر چاکەکارو لەخواترس بوو، هەروەها دەیتوانی فەرمانێ دەربکات کە ڕشتنی خوێنی حوسەین بە قەدەغەو هێڵی سوور دابنێ، یان کاتێ حوسەین شەهید کرا دەیتوانی بە کوشتنی ئیبن زیاد تۆڵەی بکاتەوە، هەروەها دوای ئەو هەڵە گەورەیە دوو هەڵە گەورەکەی تری نەدەکرد کە هاوەڵانێکی گەورەی شەهید کردو حورمەتی مەککەو مەدینەی بەزاند.

---

[1] - تأريخ الطبري، ج٣، ص٢٩٨.

[2] - البداية والنهاية، ج٨، ص١٩٥.

هاوکات لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا هیچ بەڵگەیەکی ڕاشکاو نیە تا بتوانین یەزید لە بازنەی ئیسلام دەربکەین‌و بێ ویژدانیشە هەندێ هەنگاوی ئیجابی لەبیر بکرێن، بەڵام ئەو سێ هەڵەیەی زەق‌و ڕەق بوون، ئەگەر نا لە پەرستشەکان‌و ڕێڕەوی گشتی ئیسلامدا لە بازنە گشتیەکە ماوەتەوە، ئیتر بە ڕووکەش بێ یان نا ئەوەیان زانستی خواییە، ئێمە سەرکۆنەی تەواوی هەڵەکانی دەکەین‌و تەبەرا دەکەین لە کارە خراپەکانی.

هەندێ وەك ئیمامی غەزالی بە کەسێکی چاکی دەزانن‌و هەڵەکانی بە ئیجتیهاد دەزانن، هەندێ وەك ئیمام ئەحمەد بڕوایان وایە باوەڕدار نابێ خۆشی بوێ.

## نۆیەم: لایەنە ئیجابی و سلبیەکانی شۆڕشەکە:

یەکەم: لایەنە ئیجابییەکانی شۆڕشەکە:

أ- نیازی شۆڕشەکە لەسەر بنەمای نیەتێکی پاك بوو نەك حەزی دووبەرەکی یان کێشە نانەوە.

ب- هەنگاوەکانی شۆڕشەکە ئاشتیانە بوون، بەڵام دواتر بە ئاقاری جەنگدا برا.

ج- ڕوونی داوای شۆڕشەکە: حوسەین بە ڕوونی داواکەی دەخستەڕوو، ئەویش گێڕانەوەی شووراو لابردنی یەزید بوو، بۆ بەدیلیش خۆی پێشنیار کرد.

د- ئامادەبوون بۆ ئاساییکردنەوەی بارودۆخ: کاتێ حوسەین زانی کارەکە سەردەکێشێ بۆ خوێن ڕژان خێرا بەدیلی چاکی خستەڕوو، یان دانووستان لەگەڵ سەرکردایەتی وڵات، یان گرتنە ئەستۆی ئەرکێکی گرنگی وڵات کە بانگەوازو پاراستنی سەر سنوورە، یان گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆی‌و بێدەنگ بوون لەپێناو خوێن نەڕژان.

لایەنە سلبیەکانی شۆڕشەکە:

أ- پەلەکردنێکی بەرچاو لە هەنگاوەکانی شۆڕشەکەدا بە جۆرێ کەسانی دیاری بۆ خۆی ڕانەکێشاو زۆر بە ساکاری‌و ناکامڵی هەنگاوە خێراکانی دەنا.

ب- ئەزموون وەرنەگرتن لە مێژوو بەوەی برېرەی پشتی شۆڕشەکەیان بە کووفەدانا کە بنکەو پێگەی پشت بەردانی ئیمامی عەلی‌و پشت شکاندنی ئیمامی حەسەن بوو.

ج- لاوازی موسلیم لە ڕووی سیاسیەوە کە ئەرکی سەرەکی کارەکەی لە کووفە لەئەستۆ گرتبوو، چونکە یەکپارچە لەسەر بنەمای سۆز ئیشی دەکردو دەروونی کۆمەڵگەی کووفی نەخوێندبوویەوە.

د- نەبوونی هەواڵگر لە نێو سوپاو ڕێکخستنی بەرامبەردا بەجۆرێ تا ڕووداوەکە دەهاتە ڕێیان ئینجا دەیانزانی.

هـ- ئەو کوژران‌و خوێنڕژانە بوو بە تانەیەك بۆ مێژووی ئیسلامی، هەروەها دووبەرەکی کەوتە ناو موسڵمانان‌و سەرهەڵدانی ڕەوتی جیاوازی سیاسی‌و بیروباوەڕی‌و مەزهەبی‌و درێژەکێشانیشی تا ئەمڕۆو ڕژانی خوێنێکی زۆر بە بیانووی ئەو شۆڕشەوە.

## سەرچاوەکان

١- القرآن الكريم

٢- صحيح البخاري

٣- سن الترمذي

٤- سنن ابن ماجة

٥- سنن الدارمي

٦- مسند أحمد بن حنبل

٧- مسند أبي يعلى الموصلي

٨- صحيح ابن حبان

٩- السنن الكبرى للنسائي

١٠- المستدرك على الصحيحين

١١- شعب الإيمان للبيهقي

١٢-الجامع الصغير و زيادته للألباني

١٣-صحيح ابن ماجة للألباني.

١٤-المعجم الكبير للطبراني.

١٥-ابن عبدالبر: الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ط١، دار الجيل(بيروت – ١٤١٢هجري).

١٦-ابن الأثير: أسدالغابة، ط١، دار إحياء التراث العربي(بيروت - ١٩٩٦).

١٦-ابن الأثير: الكامل في التأريخ، ط٢، دار الكتب العلمية(بيروت- ١٤١٥هـ).

١٧-ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ط١، دارالجيل(بيروت – ١٩٩٢).

١٨-ابن كثير: البداية والنهاية، مكتبة المعارف، بيروت.

١٩-الذهبي: تأريخ الإسلام، ط١، دار الكتاب العربي(بيروت – ١٩٨٧).

٢٠-الذهبي: سير أعلام النبلاء، ط٩، مؤسسة الرسالة(بيروت – ١٤١٣هـ).

٢١-ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ط١، دار ابن كثير(دمشق – ١٤٠٦هـ).

٢٢-الصفدي: الوافي بالوفيات، دار إحياءالتراث(بيروت – ١٤٢٠هـ).

٢٣-ابن سعد: الطبقات الكبرى، دار صادر، بيروت.

٢٤-الطبري: تأريخ الرسل والملوك، دار الكتب العلمية، بيروت.

٢٥-أبو القاسم الطبراني: المعجم الكبير، ط٢، مكتبة الزهراء(الموصل – ١٤٠٤هـ).

٢٦-ابن الجوزي: المنتظم في تاريخ الملوك والأمم، ط١، دار صادر(بيروت-١٣٥٨هـ).

٢٧-الصلابي: الدولة الأموية، دار المعرفة(بيروت - ).

# بەرهەمەکانی نووسەر

## نووسینەکان

١. ئیبن تەیمیە (ڕەچەڵەک و ڕۆڵی لە مێژووی ئیسلامیدا). (چاپکراوە).

٢. ناسینی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ). (بەرگی یەکەم). لە ژێر چاپدایە..

٣. ژیانی پێغەمبەر ﷺ بۆ منداڵان. (چاپکراوە).

٤. ژیانی خەلیفەکانی پێغەمبەرﷺ بۆ منداڵان. (چاپکراوە).

٥. هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بۆ منداڵان.(چاپکراوە).

٦. ژیانی هەڵکەوتەکانی ئیسلام بۆ منداڵان(چاپکراوە).

٧. پێناسی هاوەڵان(ﷺ).(چاپکراوە).

٨. ڕوانینێك بۆ مێژووی ئیسلامی(ئەم بەرهەمەیە).

٩. هەنگاوێك بەرەو هاوسەرگیری. (چاپکراوە).

١٠. ئیمانناسی(چیرۆك) (چاپکراوە).

## وەرگێڕانەکان

١١. چەند وانەیەك لە مێژووی ئیسلامی: شێخ محمد خضری بك (چاپکراوە).

١٢. پوختەی مێژووی ئیسلامی: د.محمد سهیل طقوش (چاپکراوە).

١٣. دەوڵەتی ئومەوی: پرۆفیسۆر دکتۆر عبدالشافی محمد عبداللطیف (چاپکراوە).

١٤. مێژووی دەوڵەتی عەبباسی: د.محمد سهیل طقوش. (چاپکراوە).

١٥. دەوڵەتی سەلجوقیەکان: د.علی محمد الصلابی وەرگێڕان بەهاوکاری شاهۆ عومەر عارف( چاپکراوە).

١٦. مەغۆل لە مێژوودا: د.فؤاد عبدالمعطی الصیاد(چاپکراوە).

١٧. مێژووی ئەییووبیی و مەملووکیەکان: د. أحمد مختار العبادی (چاپکراوە).

١٨. دەوڵەتی عوسمانی: د.علی محمد الصلابی وەرگێرانی بە هاوکاری أحمد عبدالرحمان أحمد (چاپکراوە).

١٩. پوختەی شارستانیەتی ئیسلامی، نووسینی: د.رحیم کاظم محمد الهاشمی و أ. عواطف محمد العربی شنقارو.

٢٠. جەنگە گەورەکان و فتوحاتە ئیسلامیەکان: محمد سعید مرسی (ئامادەیە بۆ چاپ).

٢١. سەرچاوەکانی ئیمامی تەبەری (نامیلکە) نووسینی:د.محمد أمحزون، لە ماڵپەری ئەیووبی بڵاوکراوەتەوە.

٢٢. پوختەی مێژووی شارستانیەتەکان، محمود شاکر، بە هاوکاری مامۆستا مووسا. (ئامادەیە بۆ چاپ).

٢٣. پوختەی مێژووی ئەورووپا لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ: پرۆفیسۆر دکتۆر جفری برۆن. (چاپکراوە).

٢٤. مێژووی نوێی ئەورووپا: چەند نووسەرێك، وەرگێڕان بە هاوکاری فارووق محمد محمدأمین (ئامادەیە بۆ چاپ).

٢٥. فیکری رۆژئاوا، ئەنوەرلجوندی.(چاپکراوە).

٢٦. بەراوردی ئایینەکان، نووسینی أنور الجندی. (چاپکراوە).

٢٧. بەراوردێك لەنێوان غەزالی و ئیبن تەیمیەدا: د.محمد رشاد سالم ( ئامادەیە).

٢٨. ژیانی هاوەڵان( سێ بەرگ)، نووسینی: محمد یوسف الکاندهلوی.(چاپکراوە).

٢٩. رەوتە هەناردەکان، نووسینی: أنور الجندی.چاپکراوە.

٣٠. بەگەورەدانانی خواو حوکمی ئەوەی قسەی پێ دەڵێت(نامیلکە)، نووسینی :د.عبدالعزیز الطریفی، لە ماڵپەری ئیسلام هاوس بڵاوکراوەتەوە.